مستەفا عەسکەری

# ئاوڕدانەوەیەک لە بزووتنەوەی





محەمەد مەلا کەریم

پێدا چووەتەوە و دای ڕشتووەتەوە و
پێشەکیی بۆ نووسیوە و پەراوێزی بۆ کردووە

**مستەفا عەسكەری**

# ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی

# هەقە

**محەمەد مەلاكەریم**

پێدا چووەتەوە و دای ڕشتووەتەوە و
پێشەكیی بۆ نووسیوە و پەڕاوێزی بۆ كردووە

لەگەڵ دوو پاشبەند بەخامەی:

**مامۆستا هەمزە عەبدوڵڵا**

**د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ**

ناوی کتێب: ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە

نووسینی: مستەفا عەسکەری

پێداچوونەوەی: محەمەدی مەلاکەریم

بڵاوکراوەی ئاراس – ژمارە: ٧٨٩

دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: کارزان عەبدولحەمید

بەرگ: مریەم موتەقیان

چاپی دووەم، هەولێر – ٢٠٠٨

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٧٦٦ی

ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

# پێشەکیی چاپی دووەم

لە مێژووی مرۆڤایەتیدا چەندین بزووتنەوەی چاکسازی سەرین هەڵداوە، کە هەوڵیان بۆ یارمەتیی هەژاران و ستەم لێکراوان داوە. ئاینە پیرۆزەکانیش هەریەك بەگوێرەی توانای خۆی و بارودۆخی سەردەمی خۆی هەوڵی چاکسازییان داوە و کاریگەریی زۆریان لەم بوارەدا بووە. ئاینی ئیسلام لەم مەیدانەدا دەستی باڵای بووە، لەبەرئەوە لە چوارچێوەی ئەویشدا و لە سایەی بیروباوەڕەکانی ئەودا جۆرەها بزووتنەوە بەرپا بووە. ئەم هەوڵدان و بزووتنەوانەی لە ناو موسوڵمانانندا پەیدابوون، تێکڕا لە ململانێدا لەگەڵ حوکمڕانان و دەسترۆیشتووانی سەردەمی خۆیاندا یەکێك لەم دوو شێوەیان گرتووەتە بەر:

١- شێوەی شۆڕش و بەکارهێنانی هێز و توندوتیژی نواندن، وەك لە بزووتنەوەی حەزرەتی حوسێنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب و ئەو شۆڕشانەی پاش ئەو کە هەموو بەنەڵقەی یەك زنجیرە لە قەڵەم دەدرێن، شۆڕشی زەنگ (ثورة الزنج) و شۆڕشی قەرمەتییەکان (ثورة القرامطة) و هیچی تر.

٢- شێوەی وریاکردنەوە و خۆ دوورگرتن لە توندوتیژی لە چارەسەرکردنی گیروگرفتەکاندا، لە ڕێگەی گفتوگۆ و نووسین و بڵاوکردنەوەی بیر و بۆچوونەوە، بۆ هێنانە دیی ئەو چاکسازییەی مەبەست بووە، هەرچەند هەندێ لەمانەش کە دەستەڵاتیان پەیدا کردووە، بۆ خۆیشیان زۆر و هێز و ئازاردانیان بەرانبەر نەیارەکانیان بەکار هێناوە. وەك وا بووە کە موعتەزیلەکان و حەنبەلییەکان بەرانبەر بەیەك کردوویانە.

چوونە ناو قووڵاییی ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ئەم

بزووتنەوانەوە، پێویستی بەهەوڵ و تەقەلاّی زۆرە، لێکۆڵینەوە و گەڕانەوە دواوە بۆ ناخی قۆناغە مێژووییەکانی دەوێ کە ئەم بزووتنەوانەیان تێدا بەرپا بووە و بەپێی بەسەرکردنەوەی سەرچاوەی پەرش و بڵاو لە بارەیانەوە، کە ئەوەیش، بەتایبەتی لەم کارەماندا، بەئێمە ناکرێ و ئەوەمان مەبەست نییە.

ئەوەی ئێمە لەم کتێبەدا مەبەستمان بوو ناساندنێکی مامناوەندیی «بزووتنەوەی هەقە» بووە بەجەماوەری خوێندەوارانی کورد، ئەو بزووتنەوەیەی لە ناوچەی «سوورداش»ی پارێزگای سلێمانیی کوردستانی عێراقدا لە چارەگی دووەمی سەدەی ڕابردوودا ڕووی دا و لە ماوەیەکی کورتدا چەندین ناوچەی کەرکووك و تا ڕادەیەك هەولێریشی گرتەوە و خەڵکیش و حکوومەتیشی بەخۆیەوە خەریك کرد و داوونەریتێکی وای هێنایە ئاراوەکە خەڵکی هەرگیز لەوەوپێش بەخۆیانەوەیان نەدیبوو.

بزووتنەوەی هەقە لەسەر دەستی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە دامەزراوە، کە ڕابەرێکی تەریقەتی نەقشبەندی بووە. ئەو تەریقەتەی مەولانا خالیدی کوردی جافی مکایەڵی لە چارەگی یەکەمی سەدەی هەژدەمدا هێنایە ناوچەی سلێمانی و بۆ جاری دووەم یا سێیەم لە کوردستاندا زیندووی کردەوە. پاش کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریمیش مامەڕەزای برای بوو بەڕابەر و گوڕێکی تازەی دایە و لە ڕێبازێکی ئاینیی ڕووتەوە کردی بەبزووتنەوەیەکی چاکسازیی کۆمەلاّیەتی و سیاسی. هاوسانییەکی ئابووریی لە ناو جووتیارانی شوێنکەوتوویدا دانا و ڕۆڵێکی پڕ بایەخی لە ئازادکردنی ئافرەتاندا بینی کە لە ئەنجامی زوڵم و ستەمی کەڵەکە کردووی سەدەهای ڕابردووی کۆیلایەتی و دەرەبەگییەوە کەوتبوونە ژێر باری قورس و سەنگینیەوە. گیانی برایەتی و تەبایی و وەك خۆ ڕوانینە خەڵکی دەوروبەری لە ناو کۆمەلاّنی جووتیاری لادێدا بڵاو کردەوە، کە

لەوەوپێش تەنیا وەك چەمكێكی تیۆریی ڕووت ئاینەكان ئەوەندەی بكرایە بە خەڵكیان ڕادەگەیاند و لە بوارێكی ئێجگار تەسكدا نەبێ، نەدەچووە بواری پراكتیكەوە.

گەشەكردنی بزووتنەوەكە و تەنینەوەی بەناو جەماوەری خەڵكدا و زوڵم و زۆری ئینگلیزەكانی حوكمڕانی ڕاستەقینەی ئەو سەردەمەی عێراق و حوكمڕانە عێراقییەكانی نۆكەری ئەڵقە لە گوێیان كە بەهەموو هێز و توانایەكیانەوە هەوڵیان بۆ سەر پانكردنەوەی ئەو بزووتنەوەیە و خنكاندنی لە بێشكەكەیدا دەدا، وای كرد بزووتنەوەی هەقە بچێتە پاڵ بزووتنەوەی نەتەوەیی و نیشتمانیی گەلی كوردەوە و هەقەكان بەشداریی بەرچاویان لە تێكۆشانی ئەو سەردەمەی گەلەكەیاندا ببێ. هەر لەم سۆنگەیەوە بوو، پاش پێكەوەنانی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان لە عێراقدا، شێخانی حەقە چوونە ڕیزی بانگڕاهێلانی ئەم بزووتنەوەیەوە و ئیمزا و پەنجەمۆری خۆیان و شوێنكەوتوانیان هەمیشە بەسەر یاداشتەكانیانەوە بوو.

ئەم نووسینەم لە بارەی هەقە و بزووتنەوەكەیانەوە چیرۆكێكی هەیە بەپێویستی دەزانم لێرەدا بیگێڕمەوە:

سالانی ١٩٦٣-١٩٦٥ لە زیندانی (نوگرە سەلمان) بووم. دوای ڕامالینی حوكمی بەعسییەكان لە ١٨/١١/١٩٦٣دا پشوویەكمان دا، دەست كرا بەڕێكخستنی كاروباری ژیانی ناو بەندیخانەكە، وەك ئاهەنگگێڕان لە بۆنە نیشتمانییەكان و جەژنەكانی وەك جەژنی نەورۆز و هەروەها بەدەرس گوتنەوەی زۆر لە زانستەكان و زمانەكان و نەهێشتنی نەخوێندەواری و ڕێكخستنی زنجیرەیەك كۆڕی ڕۆشنبیری بەشێوەی ئەڵقە و ئەڵقەی بەرانبەر و پێشبڕكێكردن لە نێوان ئەڵقەكاندا بۆ وەڵامدانەوەی كۆمەڵێك پرسیار كە بۆ ئەو مەبەستە دادەنران.

لە ئێوارە کۆڕێکدا پرسیارێك کرا: «بزووتنەوەیەکی چاکسازی لە کوردستانی عێراقدا پەیدا بوو بەناوی «هەقە»وە. چی لەم بارەیەوە دەزانن؟» دادیار (محامی) مامۆستا عەبدولوەهاب قەیسی لە یەکێك لە گرووپەکانی پێشبڕکێکەدا بوو هەڵسایە سەرپێ و بەکورتی هەندێ قسەی کرد، ئینجا گوتی: من ئەم زانیارییانەم لە مامۆستا ساڵحی کوڕی کاکە ڕەزای عەسکەری وەرگرتووە کە لە بنەماڵەی شێخەکانی هەقەیە، کاتێك هەردووکمان لەم بەندیخانەیەدا بووین. بەڵام ئێستا دادیار مستەفا عەسکەری کە برای گەورەی ساڵح عەسکەرییە، لێرەیە و لەم کۆڕەدا ئامادەیە. تکایە کێ پرسیاری هەیە لەوی بپرسێ، وەڵامی دەداتەوە. ئەو دەستەیەی زنجیرە کۆڕەکانیان بەڕێوە دەبرد داوایان لێ کردم چی لێ دەزانم بۆیان باس بکەم. منیش، ئەوەندەی دەرفەت هەبوو، بابەتەکەم بۆ ڕوون کردنەوە. لە کۆتاییدا داوایان لێ کردم شتێك لەو بارەوە بنووسم بۆ ئەوەی بەشێوەی نامیلکەیەك لە بەندیخانەکەدا بڵاو بکرێتەوە. نووسیم. پاش ئەوە بارودۆخێکی سەخت بەسەر بەندیخانەکەدا هات، نامیلکەکە لەو نێوانەدا لەناو چوو.

بەهۆی گۆڕانی بارودۆخی وڵات و گەڕانەوەی بەعسییەکانەوە لە ١٩٦٨دا بۆ حوکمڕانیی عێراق، نەمتوانی جارێکی تر ئەم بابەتە بنووسمەوە. تا پرسیارەکەی مامۆستا محەمەدی مەلاکەریم لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی (عێراق) سەری هەڵدا و شێخ حەسەن عەودالآنی بەدەم پرسیارەکەیەوە چوو و بابەتێکی لە گۆڤاری (ڕەنجی کرێکار)دا بڵاو کردەوە. لەم دەروەوە کە کرایەوە، برادەری دڵسۆز و خۆشەویستم و هاوکاری پیشەم دادیار مامۆستا حەمید بلباس لەو ڕۆژانەدا هانی دام سەرلەنوێ شتێك لەسەر بزووتنەوەکە بنووسم. منیش شتێکی کورتم نووسی کە لە ڕاستیدا بڕوام نەبوو دەستەڵاتی بەعسی ڕێی بڵاوکردنەوەی بدا، بەڵام بەهەوڵی مامۆستا محەمەدی مەلاکەریم بوو بەکتێبێك و بڵاو

کرایەوە و گەیشتە دەستی خوێندەواران.

لەم چاپی دووەمی ئەم کتێبەدا هەوڵم داوە هەندێ زانیاریی تری تێدا جێ بکەمەوە، بەتایبەت ڕا و بۆچوونی هەندێ لەوانەی لە نزیکەوە ئاگەداری هەڵسوکەوتی هەقەکان بوون. هیوادارم توانیبێتم خزمەتێك پێشکێشی یادی بزووتنەوەی هەقە و ڕۆڵەکانی نەتەوەکەیشم بکەم. هەروەها هیواداریشم ڕۆشنبیران و ئەوانەی بەدوای توێژینەوە لەم مەسەلەیەدا عەودالن، بەدرێژی باس و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن و بنووسن.

سلێمانی - مستەفا عەسکەری

٢٠٠٨/٣/١١

## پێشەکیی چاپی یەکەم

لەم کوردستانەی ئێمەدا بەدرێژاییی مێژوو، گەلێ بزووتنەوەی ئاینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی، بەرانبەر بەئاینی یا ڕێبازی ئاینیی فەرمانڕەوا، یا بەرانبەر بەدەسەڵاتی کاربەدەست، یا لە دژی نەریتی کۆمەڵایەتیی باو – ڕوویان داوە، کە لێکیان دەدەینەوە، هەریەکەیان بەپێی بارودۆخی ڕوودانی، کاکڵێکی پێشکەوتنخواز یا کۆنەپەرستیی بووە، بەڵام تێکڕای ئەم بزووتنەوانە، چەردەیەکی لایەکی دەنگوباسی کەمێکیان نەبێ، ناویان کوێر بووەتەوە، هیچ کتێب و سەرچاوەیەك لێیان نەدواوە، ئەگەر ئێستا پاشماوەیەکیان لە ناو خەڵك یا لە فۆلکلۆری سەرزارەکیدا مابێ، بەپێی گۆڕانی بارودۆخی زەمانە و هەڵوێستی خەڵکی تر کە باسی ئەو بابەتەیان کەوتووەتە ئەستۆ، گەلێ گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بەهۆی ئەوەوە، ئەمڕۆ نووسینی مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و کولتووریی گەلی کورد ئەرکێکی نێجگار قورسە و خستنەکاری توانێکی زۆر و تاوتووکردنی دەیان سەرچاوە و هەڵدانەوەی هەزاران لاپەڕەی مێژووی ئەوێ.

ئەمەش وەنەبێ هەر بەشبەحاڵی ڕووداوە دێرینەکانمان وابێ کە لەوانەیە ئەوان بەهۆی باری شارستانەتیی تا ڕادەیەك ئازادبیرانەی ئەو سەردەمەی جیهانیی ئیسلامەوە شتێکی باشیان لە بارەوە دەستگیر ببێ، بەڵکو تەنانەت بەشبەحاڵی بزووتنەوەکانی ئەم سەدەی بیستەمەشمان ڕاستە کە مێژووی هیچ کامێکیان لە هەموو سەرێکیەوە بەباشی نەنووسراوە و نایزانین. خۆ ئەگەر قسە لە سەدەکانی ناوەڕاست بکەین کە جیهانی ئیسلام هەمووی بەجارێ کەوتبووە ژێر دەواری ڕەشی نەزانی و کۆتکردنی بیر و پاشکەوتووترین شێوەی حوکمڕانیی دەرەبەگیانەوە،

ئەوە بابەتەکە هەر بەجارێ ئاڵۆز دەبێ و پێویستمان بەهەڵدانەوەی ئەرشیفی سەدان ساڵی ئەستەمبووڵ و ئێران و کتێبخانە گەورەکانی ئەورووپا و تەماشاکردنی هەموو دەستنووسە پێوەندیدارەکانی حوجرە و مزگەوت و کڵێساکانی کوردستان دەبێ.

یەکێ لە ڕووداوە بایەخدارەکانی ئەم سەدەیەی کوردستانی خوارووی بەرپابوونی بزووتنەوەی (هەقە)یە کە بزووتنەوەیەکی ئایینی – کۆمەڵایەتیی بەڕاستی مەزن بوو و لێکدانەوەی ڕاستەقینەی پێویستی بەپێداچوونەوەی بزووتنەوەی سۆفیەتی و بیروباوەڕ و ئایدیای باتینییەکان و تاقمی (ئەهلی حەق) و گەلێ لەو ڕێبازانەی ترە کە لە جیهانیی ئیسلامدا پەیدابوون، سەرەڕای بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی خەڵکی ناوچەکانی سنووری عێراق و ئێرانی ئێستا کە عەودالّی دوای دادی کۆمەڵایەتی و دانانی سنوور و ڕادەیەك بوون بۆ جەور و ستەمی حوکمڕانەکانیان.

تا ئێستا شتێکی پڕ بەپێست و تێروتەسەل لە بارەی ئەم بزووتنەوەیەوە بڵاو نەکراوەتەوە[١] ئەم بابەتەیش کە ڕۆشنبیری پێشکەوتنخوازی ئاگەدار

---

(١) ئەوەندەی من پێی بزانم تا ئێستا لە وتارێکی کاك حەسەن عەوالّانی بەولاوە کە لە ژێر شادێری «تیشکێك بۆ نووسینەکەی محەمەدی مەلاکەریم لە ڕۆژنامەی عێراقدا»، لە ژمارەی (٦)ی ساڵی چوارەم [١٩٨٠]ی بڵاوکراوەی «ڕەنجی کرێکار»ی یەکێتیی نەقابەکانی کرێکارانی سلێمانیدا، بڵاوی کردووەتەوە – هیچ بابەتێکی تر لە بارەی بزووتنەوەی هەقەوە بڵاو نەکراوەتەوە. ئەوەش – وەك خۆی نووسیویە – پتر پشتی بەو زانستییانە بەستووە کە لە بنووسی ئەم کتێبەوەی وەرگرتوون. نووسینەکەی منیش کە لە شادێری وتارەکەیدا ئیشارەتی بۆ کردووە، ڕستەیەکە لە وتارێکمدا نووسیومە لە ژمارە (٣١)ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٩ی پاشبەندی کوردیی ڕۆژنامەی (العراق)دا بڵاوم کردووەتەوە و گلەییم لەوە تێدا کردووە کە بزووتنەوەیەکی مەزنی وەك بزووتنەوەی هەقە تا ئەو کاتە هیچی لەسەر نەنووسراوە. لەو وتارەی کاك حەسەن عەوالّانی بەولاوە، مامۆستا هەمزە =

کاک مستەفا عەسکەری نووسیویە کە خۆی لە بنەماڵەی شێخەکانی تاقمی (هەقە)یە کە ئەوان بوون ئەم بزووتنەوەیەیان داهێنا، ئەو لێکۆڵینەوەیە نییە کە مەسەلەکە بەجۆرێکی ئەوتۆ یەکلا بکاتەوە و ئیتر پێویست بەزیاتر

---

= عەبدوڵلایش دەڵێ: «لە ١٩٥٦دا وتارێکم نووسی نیاز وابوو لەو ساڵنامە کوردییەدا بڵاو بکرێتەوە کە کۆمەڵێ لە ڕۆشنبیرانی کورد بەتەمابوون لە چاپی بدەن بەڵام بۆیان نەچووە سەر». هەروەها دەڵێ: «جارێکیشیان لە وەڵامی پرسیارێکی ناوخۆی ڕێکخراوەی پارتیی دیموکراتی کورددا لە کۆیە، باسێکم لە بارەی هەقەوە نووسی. باسەکە بەرۆنیو لە چاپ درا و لە ناو ڕێکخراوەکانی پارتیدا بڵاو کرایەوە، بەڵام بڵاوکەرەوەکانی هەندێ دەسکارییان کردبوو».
با بگەڕێینەوە بۆ سەر بنجی بابەتەکەمان. لە ڕووی سیاسەت و کۆمەڵایەتی و مێژووەوە بیگرین، بەسەرکردنەوەی بزووتنەوەی هەقە ئەوەندە بووە کە باسمان کرد. لە ڕووی ئەدەب و هونەریشەوە بۆی بچین، دەبینین تا ئێستا هیچ کام لە ئەدیب و هونەرمەندەکانی هیچ لقێ لە لقەکانی ئەدەب و هونەری کوردی، با بەڕاگوزاریش بێ، لایەکیان لە بەرهەمە ئەدەبی و هونەرییەکانیاندا بەلای ئەم ڕووداوە گەورەیەی بزووتنەوەی هەقەدا نەکردووەتەوە. لە کاتێکدا کە ڕاستەکەی، چ جۆری ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتیی هەقەکان لە بارەی هاوسانیی ئابووری و ئازادیی ئافرەتەوە و چ ئەو ڕەوتە قارەمانانە درێژەی تێکڕا لە ناوچەکانی خۆیانەوە کردیان بۆ کەرکووک و ئەو ڕادەی سوورییە لەسەر هێنانە دیی داخوازییەکانیان، شایانی ئەوەن چەند داستانی شیعر و چیرۆك و ڕۆمان و شانۆنامەیان لەبارەوە بنووسرێ و چەند گۆرانی و ئاوازیان بۆ دابنرێ و وێنەیان بۆ بکێشرێ و پەیکەریان بۆ بتاشرێ. من بێگومانم لەوە کەوا شانۆ و سینەمای دواڕۆژی کوردستان ڕۆژی خۆی ئەم بابەتە بەباشی پێشکێشی تەماشاکەرانی کورد و جیهان دەکەن، بەڵام دەستهێنشخەریی ئەمڕۆی بنووس و هونەرمەندانی کوردیش بایەخی خۆی هەیە و بایەخەکەی لەوەدایە کە هێشتا گەلێ لە بەشدارانی ئەم بزووتنەوەیە ماون و بەهۆی ئەوەوە دەتوانرێ بەڵگەی ڕاست و دروست و ورد بۆ ئەم کارە ئەدەبی و هونەرییانە ئامادە بکرێ. دەسا با ئێمەش چاو لە گەلە زیندووەکانی جیهان بکەین و نەهێڵین ئەم کەلەپوورە پڕ شان و شکۆیەمان کوێر ببێتەوە – م. م. ك.

نەبێ. بەڵام، هەرچۆن بێ، من بەلای خۆمەوە، وەك هەنگاوی یەكەم بەم ڕێگە پێشتر نەكوتراوەیەدا، بەكارێكی مەزنی دەزانم. بۆیە كە ئەم دۆستە دڵسۆزەم لە نووسینی ئەم بابەتەی ئاگەداری كردم، زۆرم پێ خۆش بوو و گفتم دایە منیش لە لای خۆمەوە، ئەوەندەی كە ئەمڕۆ لە دەسەڵاتدا هەیە، پێدا بچمەوە و چاوی بۆ پێدا بگێڕمەوە و لە هەندێ شوێنی پێویستدا پەراوێزی بۆ بنووسم[٢] و لە پێشكێشكردنیدا بەخوێندەوارانی چاوكراوەی گەلەكەمان یارمەتیی بدەم.

لەبەرئەوەش كەوا هێشتا گەلێ كەس ماون لە ناو كۆڕی بزووتنەوەی هەقەدا بوون و ژیاون، كەسانی تریش هەن بەدوای لێكدانەوەی ئەم مەسەلەیەدا گەڕاون، وام بەباش زانی ڕەشنووسی كتێبەكە بخەمە بەردەستی هەندێ لەمانە و داوای دەربڕینی بیروڕای خۆیانیان لێ بكەم. لەم ڕووەوە پرسم بەكاك مستەفا خۆیشی كرد، ئەویش بۆچوونەكەمی لا پەسەند بوو و بەهەردووكمانەوە مامۆستایان هەمزە عەبدوڵلا و شێخ حوسەینی خانەقامان دەستنیشان كرد و پاشان خۆم پیشانی برایان شێخ ستار «د. عەبدولسەتار تاهیر شەریف» و دوكتۆر عیزەدین مستەفاشم دا. ئەم بەڕێزانە هەموویان هەریەكە كۆمەڵێ سەرنجیان بۆ خستمە سەر قاقەز و بەدەمیش هەندێ شتیان پێ وتم كە بەناوی خۆیانەوە خراونەتە پەراوێزەوە. مامۆستا هەمزە و د. عیزەدین یەكی پاشبەندێكیشیان بۆ كتێبەكە نووسی كە لە داوێنیەوە بەناوی خۆیانەوە بڵاو كراوەتەوە. هەر بەپێی پێشنیهادی مامۆستا هەمزەیش ناوی كتێبەكەمان گۆڕی[٣] كە پێشان بەمجۆرە بوو: «بزووتنەوەی (هەقە) بزووتنەوەیەكی

---

(٢) پەراوێزەكانی خۆمم بەنیشانەی «م. م. ك.» لە پەراوێزەكانی كاك مستەفا عەسكەری خۆی جیا كردووەتەوە. لەو پەراوێزانەشدا كە هەردووكمان تیایانا بەشدارین، بەشەكەی خۆمم خستووەتە نێوان دوو كەوانەی لەم چەشنەوە: [ ] – م. م. ك.

(٣) شێخ ستاریش، بەشبەحاڵی خۆی، بێ ئەوەی ئاگای لە پێشنیهادەكەی مامۆستا هەمزە ببێ، پێشنیهادێكی لەم چەشنەی دامێ – م.م.ك.

نیشتمانپەروەر بوو». مامۆستا هەمزە، بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستی لەم پێشنیهادەی، وتی: «بزووتنەوەی هەقە لە پێشاندا بۆ ئامانجی نیشتمانپەروەرەی نەبوو، هەرچەند پاشان بەگوێرەی بارودۆخی سیاسیی وڵات کەوتبێتە بەرەی نیشتمانپەروەری و بەڵکو پێشکەوتنخوازیشەوە و هەرچەند هەر بزووتنەوەیەك دەبێ کاکڵێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی پێشکەوتنخواز یا کۆنەپەرستی هەبێ. کاکڵی بزووتنەوەی هەقەش – وەك بزووتنەوەیەکی جووتیاران – کاکڵێکی دژی ڕژێمی کۆنەپەرست و نۆکەری حوکمڕان و سیستەمی دەرەبەگیی لادێکانی ئەو ڕۆژەی کوردستانی بووە». ئێستاش کەوا دەرفەتی ئەوە ڕەخساوە ئەم کتێبە بەم شێوە سەرەتاییە پێشکێشی خوێندەوارانی ئازیزی کورد بکرێ، بەدڵ ئاواتەخوازی ئەوەم ببێ بەڕچەشکێنی کەسانی تریش، تا ئەوانیش چ لەم بابەتە و[4] چ لە بابەتە هاوشێوەکانیدا[5]، بنووسن و هەریەك لایەکی مێژووی کۆمەڵایەتیی نەتەوەکەمان ڕوون بکەنەوە.

**محەممەدی مەلا کەریم**

**١٩٨٢/٩/١٤**

---

(٤) بەئاواتی ئەو ڕۆژەوەم بیرڕووناکێکی شارەزا هەڵکەوێ کتێبێکی بەپێز لە بارەی ئاین و ڕێبازی مێژووی کاکەییەکانی کوردستان، بە هەموو لق و پۆپەکانیانەوە بنووسێ – م.م.ك.

(٥) شێخ ستار بەتایبەتی بایەخ بەوە ئەدا کە پێویستە کەسانێکی لێهاتوو سەر لەو کەسانە بدەن کە لە بزووتنەوەی هەقەدا دەوریان بووە و هێشتا ماون، پرسیاریان لێ بکەن و وەڵامەکانیان بەدەنگی خۆیان بخەنە سەر شریت و بڵاوی بکەنەوە. ئەو خۆی لە ١٩٧٩/١/١٠دا دیدارێکی لەگەڵ مەلا سەلامی کوڕی مەلا مستەفای ترێخۆر کردووە لەسەر شریت لە کەرکووك [بۆ زانینی زیاتر لە بارەی ئەم مەلا سەلامەوە کە ئێستا لە دنیا دەرچووە بڕوانەرە پەراوێزی ژمارە (٢) ل٦٤] شێخ ستار ئەو شریتەی دایە لام، گەلێ بابەتم لەبەر نووسییەوە و لە ناو پەراوێزەکانی ئەم کتێبەدا جێم کردنەوە. ئیشارەتیشم بۆ ئەوە کردووە کە ئەو بابەتانە لەو شریتە وەرگیراون – م.م.ك.

## کورتە باسێك

## لە بارەی سۆفیەتی و تەریقەتی نەقشبەندییەوە

سۆفیەتی، لە بنەڕەتدا، لە سوننەتی پێغەمبەرەوە سەری هەڵداوە (دروودی خوای لێ بێ). سوننەتی پێغەمبەریش بریتییە لە فەرموودە و کردەوەکانی و لەو کردەوانەی هاوڕێکانی کە ئەو نارەزاییی لێ پیشان نەدابن. لە سەردەمی پێغەمبەر خۆی و هەروەها لە سەردەمی هاوڕێیانی و لە سەردەمی ئەوانەیشدا کە لە پاش ئەوان هاتوون، واتە (الصحابة والتابعین) کەسانێك بوون لە خۆشیی دنیا و حەزبەماڵ و دەستەڵات خۆیان دوور ڕاگرتووە و خەریکی خواپەرستی و ڕاگرتنی جەوهەری ئاین و ئاینداری بوون و جلوبەرگی سادە و ساکاریان لەبەر کردووە و لە ئارەزووی نەفس دوور کەوتوونەتەوە[١].

مەسەلەکە لە سەردەمی پێغەمبەر و هاوڕێیانیدا وا بەسەر چووە، بەڵام پاشان گۆڕانی بەسەردا هاتووە چونکە خەڵکەکە ئارەزووی خۆشیی دنیایان زۆر بووە و لەوەوە ئەم ڕێبازە جیاوازانەی سۆفیەتیش بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی خەڵك و کۆمەڵ پەیدابوون. ئەم ڕێبازانە ناوی ئەو کەسە ناودارانەیان لێ نراوە کە سەرکردایەتییان کردوون و بنەماکانیان داناون، وەك دەگوترێ (سیدیقی) کە دەڵێن دەگەڕێتەوە بۆسەر ئەبوبەکری سیدیق (خوای لێ ڕازی بێ)، یا (تەیفووری) بەناوی شێخ تەیفوورەوە کە شێخ بایەزیدی بەستامییە، یا (قادری) بەناوی (شێخ عەبدولقادری گەیلانی)یەوە، یا (نەقشبەندی) بەناوی شێخ بەهائەدین

---

(١) شێخ ئەمینی شێخ عەلائەدینی نەقشبەندی: تەسەوف چییە؟ «بغداد، دار الحریة للطباعة ١٩٨٥».

موحەممەدی بوخارایی نەقشبەندییەوە. هەروەها گەلێ ناو و نازناوی تریش.

ئەو زانا گەورانە بناخەی ئەو ڕێبازانەیان بەجۆرێك دارشتووە كە تێگەیشتنی بۆ موسوڵمانانی ساكار ئاسان بێ و سوودی لێ وەربگرن. بەم شێوەیە ئەو كارە بووە بەرەوشتێك سۆفییەكان لەسەری ڕۆیشتوون. جا هەر كام لەو ڕێبازانە بگیرێتە بەر، مەبەست هەر پێڕەوی لێكردنی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر و دووركەوتنەوە لە ڕق و كینە و دووڕوویی و حەسوودی و شەڕوشۆڕی نێوان مەزەب و ڕێبازەكانە، بەواتایەكی تر خۆ خەریككردنە بەناوی خواوە (ذیكر)(٢).

بۆ ئەم مەبەستەیش پێشەوایانی ئەهلی تەسەوف پشتیان بەئایەتی قورئان و قسەی پێغەمبەر بەستووە، وەك ئایەتی (ادعوا ربكم تضرعاً وخفیة) واتە: هاوار بكەنە خوا بەپاڕانەوەوە لێی و بەنهێنی، یا ئایەتی (ولا تطع من اغفلنا قلبە عن ذكرنا واتبع هواە) واتە: بەگوێی ئەوانە مەكە كە دڵیمان لە ناوهێنانی خۆمان بێ ئاگا كردووە و شوێنی ئارەزووبازیی خۆی كەوتووە، یا فەرموودەی (ایها الصدیقون! تنعموا بذكر الله في الدنیا، فانە لكم في الدنیا نعیم، وفي الآخرة جزاء مقیم). واتە: ئەی باوەڕ بەخواكردووەكان! خۆشحاڵ بن بەناوهێنانی خوا چونكە ناوهێنانی خوا لە دنیادا نیعمەتە و لە قیامەتیشدا پاداشتێكی پایەدار و هەرگیز

---

(٢) شێخ سەلاحەدینی شێخ تائیبی نەقشبەندی: ڕێبازی نەقشبەندی و تەسەوف، چاپی ٢٠٠٢.

بەبۆنەی باسی زیكرەوە دەمەوێ شتێك لە بارەی سۆفیەتییەوە ڕوون بكەمەوە. سۆفییەتی بەو پێناسە ڕووكەشییەی لە ناو خەڵكدا باوە، بەتەواوی نەناسرێ و نازانرێ، چونكە سۆفییەتی تام و چێژێكە تا نەگاتە (ڕۆح) مرۆڤ پەی پێ نابا. ڕاستی و دروستیی سۆفیەتی بەترازووی (ظاهر) ناكێشرێ، بەڵكو توانەوەی سۆفییە لە ڕێگەی مورشیدەكەیەوە لە زاتی ئیلاهیدا، وەك دەڵێن: (الفناء في الله).

بەسەرنەچووە، یا فەرموودەی (خير الذكر الخفي، وخير الرزق ما يكفي) واتە: چاکترین ناوهێنانی خوا ئەوەیە بەنهێنی ناوی بهێنرێ و کەس ئاگای لێ نەبێ تا نەبێ بە ڕیا، چاکترین ڕزقێکیش کە خوا بیدا بەئادەمیزاد ئەو ڕزقەیە بەشی ژیانی ئەو کەسە بکا کە پێی دراوە.

وەك باسمان کرد وردە وردە چەند شێوەیەك لە سۆفیەتیدا پەیدا بووە وەك چۆن جونەیدی و خەڕازی و هی تر. لە هەر کام لەو شێوانە، چەندین زنجیرەی تر جوێ بوونەتەوە و هەموویشیان ڕێگەی ڕەوشت و کرداری باش و خواناسانەیان گرتووەتە بەر. ناسراوترینی ئەم زنجیرانە ئەمانەن:

١- قادرییە، بەناوی شێخ عەبدولقادری گەیلانییەوە (٤٧١-٥١٦)ی کۆچی.

٢- ڕەفاعییە، بەناوی ئەبولعەباس ئەحمەدی ڕەفاعییەوە (٥١٥-٥٧٠)ی کۆچی.

٣- سوهرەوەردییە، بەناوی شێخ شەهابەددینی سوهرەوەردییەوە کە لە (٦٣٢)ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

٤- نەقشبەندییە، بەناوی شێخ موحەممەد بەهائەددینی نەقشبەندییەوە (٧١٧-٧٩٠)ی کۆچی.

نەقشبەندی لە زنجیرەیەکدایە کە سەربەندەکەی دەگاتەوە سەر ئەبوبەکری سیدیق و سەلمانی فارسی و ژمارەیەکی زۆر لە گەورەپیاوان کە بەرەو خوار دێن تا زنجیرەکە دەگاتە سەر شێخ موحەممەد بەهائەدین نەقشبەند کە نازناوی شاهی نەقشبەندی پێ دراوە، لەم زنجیرەیەدان. دوای ئەویش ژمارەیەك وەلی و سۆفی و پیاوچاك تا دەگاتە سەر شاە عوبەیدوڵڵای دەهلەوی لە هیندستان، ئینجا مەولانا خالید لە کوردستان کە لەسەر دەستی شاە عوبەیدوڵڵای دەهلەویدا تەریقەتی وەرگرتووە و بووەتە خەلیفەی و گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان و پێشان لە سلێمانی نیشتەجێ

بووە و دەستی داوەتە گوتنەوەی دەرسی ئاینی و ڕێنوێنیکردنی موسوڵمانان و تەڵقین دادانیان لەسەر ڕێبازی تەریقەتی نەقشبەندی و خەڵکێکی زۆر لە خواناسان و دەست لە دنیا هەڵگرتووان لە دەوری کۆبوونەتەوە.

ئەوانەی بەرهەڵستیان دەکرد، بوون بەمایەی ناکۆکی کەوتنە نێوان مەولانا و خاوەن ڕێبازە تەریقەتییەکانی تر. هەروەها لەگەڵ هەندێ لە میرانی بابان و دەستەڵاتدارانی سلێمانیش. لەبەرئەوە مەولانا ساڵی ١٢٢٨ی کۆچی سلێمانیی بەجێ هێشت و ڕووی کردە بەغدا.

لەوێ ڕۆشنبیران و ئەدیب و خواناسان ڕوویان تێ کرد و بەگەرمی پێشوازییان لێ کرد. والی بەغدا داوود پاشایش یارمەتیی دا بۆ ئاوەدانکردنەوەی قوتابخانەی (الاحسائیة) کە پاشان بەناوی (تەکیەی خالیدییە)وە ناوبانگی دەرکرد.

پاش چەند ساڵێك مەحموود پاشای بابان دەچێ بۆ بەغدا، لەوێ مەولانا دەبینێ و داوای لێ دەکا بگەڕێتەوە سلێمانی. مەولانایش لە ساڵی (١٢٣٢)ی کۆچیدا دەگەڕێتەوە. خەڵکی سلێمانیش بەتایبەتی مریدانی تەریقەتی نەقشبەندی و خواناسان پێشوازییەکی گەرمی لێ دەکەن. مەحموود پاشایش لە ساڵی ١٨١٦ ئەو خانەقایەی بۆ دروست دەکا کە ئێستا بەخانەقای مەولانا بەناوبانگە. لە کوردستان و حیجاز و میسر و باکوری ئەفریقا و شام و ئێران و تورکیا و ئەفغانستان و هیندستان و وڵاتانی تردا ناوبانگی مەولانا بڵاو دەبێتەوە. عاشقانی ڕێبازی نەقشبەندی لە هەموو لایەکەوە دێن بۆ سەر لێدانی و فێری زانیاریی ئاینی دەبن لای و لەسەر دەستی ئەودا تەڵقین دادەرێن و ڕێگەی ڕاستیان پیشان دەدرێ[٣].

جارێکی تریش، بەدزییەوە دەست دەکرێتەوە بەئاژاوەنانەوە و فیتنەبازی

---

(٣) مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، یادی مەردان، بەرگی یەکەم، بەغدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٩.

و دروستکردنی ناکۆکی. مەولانا هەست دەکات کەوا پێوەندیی مەحموود پاشایش لەگەڵیدا وەك جاران گەرموگوڕ نییە و شێخانی قادریش بەربەرەکانێی دەکەن بەتایبەتی بنەماڵەی شێخ مارفی نۆدێ(٤) و تەنانەت پیلان دارێژراوە بۆ کوشتنی. یەکێك لە بەشداربووانی ئەو پیلانە شێخ ئەحمەدی سەردار(٥) بووە کە لە شێخانی سەرگەڵوو بووە لە ناوچەی

---

(٤) پاش ئەوەی شێخ مارفی نۆدێ ڕاستییەکانی بۆ ئاشکرا دەبن و تێ دەگا کە مەولانا کاری خراپ دەرهەق کەس ناکا، لەگەڵیدا ئاشت دەبێتەوە و نامەی عوزرخواییی بۆ دەنووسێ. ئەمە پێش ئەوە بووە کە مەولانا بەرەو شام بڕوا.

(٥) شێخ ئەحمەدی سەردار لە سەیدەکانی بەرزنجەیە. بەبنەچە دەچێتەوە سەر شێخ عەبدوسەمەدی سەرگەڵوو کە کوڕی بابە ڕەسووڵی گەورەیە. بۆ زانیاریی زیاتر ئەم خشتەیەی خوارەوە دەخەمە بەرچاو:



سووورداش و پیاوێکی زۆر بەدەستەڵات بووە. زۆر بەتوندی دژی مەولانا وەستاوە. مەولانا، بەپێی پێڕەوی سۆفییانە «تەوەجوە»(٦) لە شێخ ئەحمەد دەکا لە کاتێکدا کە شێخ ئەحمەد ویستوویەتی مەولانا بکوژێ. شێخ ئەحمەد کەمەندکێشی مەولانا دەبێ و خۆی تەسلیم دەکا و لە لایەن مەولاناوە تەلْقینی دادەدرێ و دەبێ بەخەلیفەی تەریقەتی نەقشبەندی لە ناوچەی سووورداشدا. شێخ ئەحمەدی سەردار، جگە لەوەی پیاوێکی زانا و خواناس و هەڵکەوتوو بووە، یەکێکیش بووە لە خەلیفە ناودارەکانی مەولانا و زۆر لێیەوە نزیك بووە. مامۆستای خوا لێخۆشبوو مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس بەخەلیفەی سێیەمی مەولانای داناوە و باسی خزمەتی کردووە بەموسوڵمانان(٧).

لە ئەنجامی ناکۆکیی نێوان مەولانا و دەستەڵاتدارانی ئەو سەردەمەی ناوچەی سلێمانی و هەوڵی نارەوایی بەرهەڵستانی مەولانادا، مەولانا بڕیار دەدا بڕوا بۆ شام. شێخ ئەحمەدی سەردار بۆ ئەم مەبەستە یارمەتییەکی زۆری مەولانای داوە و بەرەو پیری چووە و میوانداریيەکی باشی لێ کردووە و پاشان بەخۆشی بەرەو ناوچەکانی شەمزینان و ئەهرێ بەرێی کردووە(٨). مەولانا بەهەر ناوچەیەکدا ڕۆیشتووە، زانایانی

---

(٦) تەوەججوە (توجە): ئەوەیە شێخەکە کار لە دڵی بەرانبەرەکەیدا دەکا و وای لێ دەکات گوێڕایەڵی شێخ ببێ. خوا لێخۆشبوو مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس ئەم لایەنەی بەباشی ڕوون کردووەتەوە کە چۆن شێخ ئەحمەدی سەردار تەسلیمی مەولانا بووە. بڕوانە مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس سەرچاوەی پێشوو.

(٧) مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٤ – ٨٨.

(٨) مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس باسی ئەم پێشوازی لێکردنەی مەولانای کردووە، بەڵام لەناو سۆفی و مریدانی نەقشبەندی ناوچەی سووورداشدا باوە، بەتایبەت لە ناو هەقەکاندا، کە دەڵێن شێخ ئەحمەدی سەردار پێشوازی لە مەولانا لە نێوان سلێمانی و سووورداشدا کردووە.

گەورە و شێخ و خواناسانی ئەو ناوچەیە بەرەو پیری چوون و زانست و تەریقەتیان لەسەر دەستیدا وەرگرتووە. مەولانا ساڵی (١٢٤٢) گەیشتووەتە شام.

هەروەك وتمان شێخ ئەحمەدی سەردار بووە بەخەلیفەی مەولانا خالید و دەستی کردووە بەتەڵقینی ڕێبازی نەقشبەندی و خواناسیی کردووە. دوای ئەویش شێخ عەبدولقادری کوڕی کە بەشێخ قادری سوور بەناوبانگ بووە، لەسەر وەسیەتی مەولانا خالید بووە بەجێگری باوکی.

## تەریقەتی نەقشبەندی لە ناوچەی سوورداش

لە ناوچەی سوورداشدا شێخ ئەحمەدی سەردار تەریقەتی نەقشبەندیی لەسەر دەستی مەولانا خالید(١) وەرگرتووە(٢).

(١) مەولانا خالید کوڕی ئەحمەدی کوڕی حوسەینی جافی مکایەڵییە. لە ١١٩٣ی کۆچی (١٧٧٩ی. ز)دا لە قەرەداغ لە دایك بووە و لە ١٢٤٢ (١٨٢٧)دا لە شام کۆچی دوایی کردووە. خوێندنی مەلایەتیی لەسەر دەستی مەلا گەورەکانی ناوچەی بابان تەواو کردووە و بۆ وەرگرتنی تەریقەت چووە بۆ هیند و تەریقەتی نەقشبەندیی لەسەر دەستی شاه عەبدوڵڵای دیهلەویدا وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان بۆ ئیرشاد و پاشان بەهۆی ناکۆکییەوە لەگەڵ میرەکانی بابان بەیەکجاری کۆچی کردووە بۆ شام [بۆ زانینی زیاتر لە بارەی تەریقەتی نەقشبەندی و مەولانا خالیدی نەقشبەندییەوە بڕوانەرە: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، یادی مەردان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩].

(٢) مامۆستا کەریم زەند دەڵێ: «مەولانا خالید، کاتی خۆی لە مێرگەپانەوە هاتووەتە سەرگەڵووی سوورداش و لەوێ شێخ قالە سووری کردووە بەجێنشینی و ئەویش شێخ ئەحمەدی سەرداری کردووە بەجێگر.. تاد» [بڕوانەرە: کەریم زەند، ئاین و باوەڕ لە کوردستاندا، سلێمانی، ١٩٧١، ل ٨٥]. بەڵام ڕاستەکەی ئەوەیە یەکەمین خەلیفەی مەولانا لەو ناوچەیەدا شێخ ئەحمەدی سەردارە و شێخ قادری سوور کوڕی شێخ ئەحمەدە و پاش مردنی باوکی دەستی کردووە بە تەریقەت دادان. شێخ ئەحمەدی سەرداریش لە سلێمانی بووە بەمەنسووبی مەولانا، نەك بەهاتنی مەولانا بۆ سەرگەڵوو [بڕوانەرە: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٨]. لە بارەی هاتنی مەولانایشەوە بۆ سەرگەڵوو، ئەوە، وەك مامۆستا کەریم زەند دەڵێ، ڕاستەو لە ناو هەقەکان خۆیشیاندا باوە، مامۆستا مەلا کەریمیش هەرچەند لە (یادی مەردان)ەکەیدا باسی نەکردووە، بەڵام بەدەم پێی وتم مەولانا بە ڕێگەی کۆیەدا کۆچی کردووە بۆ شام و لام دوور نییە لە ڕێ لای دابێتە لای =

پاش ئەویش شێخ قادری کوڕی کە بەشێخ قادری سوور ناسراوە تەریقەتی خەڵکی داداوە(٣).

ئەمجا حاجی شێخ ڕەزای عەسکەری تەریقەتی داداوە و(٤). ئەمیش شێخ موحەمەدی ئیلەڵای(٥) کردووە بەجێگیری خۆی. لە دوای ئەویش حاجی شێخ مستەفای کوڕی حاجی شێخ ڕەزا تا ساڵی ١٩١٥ تەریقەتی داداوە و

---

= مەنسوویەکانی سەرگەڵووی.

[شێخ حوسەینی خانەقایش دەڵێ: «شێخ ئەحمەدی سەردار مەولانای دەعوەت کردووە بۆ سەرگەڵوو و بەدۆڵی هەنارآندا ڕۆیشتوون. تەنانەت لە ڕێگەدا دڕکەزی قاچی مەولانای زامدار کردووە و شێخ ئەحمەد تا گەیشتوونەتە جێ خوێنەکەی مژیوە «نەگەر وابێ دەبێ ترسی ئەوەی بووبێ لێی پیس کا؟». هەر لەم سەفەرەدا شێخ ئەحمەد چەکامەیەکی وتووە ئەم دوو بەیتەم لە بیرە:

غــلام خالد کردم، ســگ صدیق و سلــمانم
که جدم سید مرسل، چه باك از کوه عصیانم
به فقر و فاقه مینازم، به یمن قاسم و جعفر
ز منسوبان طیفورم، غنی از شاه و سلطانم».

–م.م.ك.

(٣) شێخ حوسەینی خانەقا دەڵێ: «شێخ قادر منداڵ دەبێ، مەولانا لە باوەشی دەگرێ و دەڵێ ئەمە مریدی خۆمە و دیارییەکیشی هەر بەو منداڵییە خەڵات دەکا [قەڵەنسووە و تەیلەسانێك بۆ نیشانەی خەلیفەیەتی]. پاشان کە شێخ ئەحمەد کۆچی دواییی دەکا، سەید تەهای نەهری دێ بۆ کەرکووك، دیارییەکەی مەولانای دەداتێ [دیارە دەبێ دیارییەکە لای ئەو بووبێ] و ئیجازەی ئیرشادیشی دەداتێ» – م.م.ك.

(٤) شێخ حوسەینی خانەقا دەڵێ: «شێخ ڕەزای کوڕی شێخ عوسمانی کوڕی شێخ قادری قەڵاسێوکە بەوەسیەتی شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ ئەحمەدی سەردار بووە بە شێخ و ئیرشادکەر کە وەسیەتی شێخیەتیی بۆ هیچ کام لە کوڕەکانی نەکردووە و شێخ ڕەزای هەڵبژاردووە، کە ئەمەش نیشانەی ئەوەیە مەسەلەکە بەڕاستی ئیرشاد بووە نەك سوودی خێزان و منداڵ» –م.م.ك.

(٥) ئیلەڵا: گوندێکە لە ناوچەی کۆیە.

لەو ساڵەدا کۆچی دوایی کردووە. لەسەر وەسیەتی ئەم حاجی شێخ مستەفایە، پاش ئەو شێخ مەلا ئەحمەدی گەڵنێری[٦] تەریقەتی داداوە تا ئەمیش لە ساڵی ١٩١٩دا کۆچی دوایی کردووە. پاش ماوەی ساڵێك شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە لە ساڵی ١٩٢٠ەوە دەستی کردووە بە ئیرشاد و خەڵکێکی زۆر لە ناوچەی سووورداش و مەرگە و میرزا ڕۆستەم و بەری کۆیە و ئاغجەلەر و شوان تەریقەتیان لەسەر دەستی ئەودا وەرگرتووە.

---

(٦) گەڵنێری: گوندێك بوو سەر بەناوچەی میرزا ڕۆستەم لە هەرێمی ڕانیە، ئێستا بووە بەژێر ناوی گۆلی دووکانەوە.

# شەدەڵە

شەدەڵە گوندێکە لە گوندەکانی ناوچەی سووورداش لە شارستانی سلێمانی، دەکەوێتە کۆتایی دۆڵی مێرگەپان، لە نێوان شاخی پیرەمەگروون و شاخی چەرماباندا. لەم عاستەدا بەشاخەکەی دەوترێ دابان. چەمێك بەنێوان هەردوو بەری گوندەکەدا تێ دەپەڕێ. ئەو بەشەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە باسی بکەین ئەوەیانە دەکەوێتە بەری شاخی چەرمابانەوە. لە کاتی خۆیدا حاجی شێخ مستەفای کوڕی حاجی شێخ ڕەزای عەسکەری[1] کردوویە بەدێ و مزگەوتێکی تێدا دروست کردووە. لە پشت ماڵەکانی دێوە کارێزێك لێ دراوە، ئاوێکی سارد و خۆشی هەیە. بەچواردەوری کارێزەکەدا ڕەزە ترێ و دارتووە. ئاوی کارێزەکە ڕوو دەکاتە ناو ماڵەکانی گوندەکە و لەوێشەوە بەگونج بەرەو مزگەوت دەڕوا و دەڕژێتە ناو حەوزێکی گەورەوە. بەدەوری حەوزەکەدا سەکۆیەکی تاتەبەرد دروست کراوە. کاتی خۆی باخچەیەکی خنجیلانەی جوانی پڕ لە جۆرەها داری

(١) حاجی شێخ ڕەزا خەڵکی دێی عەسکەر بووە لە ناوچەی ئاغجەلەر. ئەم زاتە کوڕی شێخ عوسمانی کوڕی سەید عەبدولقادری کوڕی شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عەبدوڵلای کۆسەی کوڕی سەید شەمسەدینی کوڕی سەید عەبدولسەمەدی کوڕی سەید بابەڕەسووڵی بەرزنجەییە کە دەچێتەوە سەر ئیمامی عەلی. لە گوندی عەسکەر دانیشتووە و لە کەرکووك کۆچی دوایی کردووە و لەتەك شێخ قادری سوورەوە لە خانەقای کەرکووك بە خاك سپێردراوە.

حاجی شێخ مستەفای کوڕی ئەم زاتە لە جەنگی یەکەمی جیهاندا بۆ بەربەرەکانێی ئینگلیز چووە بۆ باشووری عێراق و لە ساڵی ١٣٣٣ی کۆچی [ڕێکەوتی ١٩١٥ی.ز]دا لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ مەعرووفی کەرخی نێژراوە، بەڵام پاشان دەریانهێناوەتەوە و گواستوویانەتەوە بۆ گۆڕستانی شێخ جونەیدی بەغدایی و لەوێ بەخاکیان سپاردووە.

بەردار و گوڵ لەبەر حەوزەکەدا بوو. داری توو و گوێز و چنار و بی بەرز بووبوو و لە هەموو لایەکەوە سەریان لێك دابوو. ئێستا ئاوی کارێزەکە یەکسەر بەبۆڕی دەچێ بۆ مزگەوتەکە. شێوەی حەوز و تاتەبەردەکان وەك جاران نەماوە، هەروەها باخچەکەیش فەوتاوە و درەختی تێدا نەماوە.

لە هەیوانی مزگەوتەکە و سەکۆکەوە تەماشای پیرەمەگروون بکەی، وەك بووکێکی ڕازاوە دێتە بەرچاوت تارای جوانی پۆشیبێ. هەر کاوە و هەر لووتکەیە دیمەنێکی تایبەتیی خۆی هەیە تێت دەگەیەنێ کەوا پیرەمەگروون بەئاشکرا شانازی بەوەوە دەکا کە یەکێکە لە شاخە جوان و سەرکەشەکانی کوردستان.

لەم گوندە جوانکیلەیەدا بوو لە کۆتاییی سالآنی هەزار و نۆ سەد و بیستدا بزووتنەوەیەکی ئاینی - کۆمەڵایەتی بەناوی (هەقە)وە پەیدا بوو. بنیاتنەری ئەم بزووتنەوەیە شێخ عەبدولکەریمی کوڕی حاجی شێخ مستەفای کوڕی حاجی شێخ ڕەزای عەسکەری بووە[٢].

---

(٢) ئێدمۆندز حاجی شێخ عارفی سەرگەڵوو بەدامەزرێنی ئەم بزووتنەوەیە دادەنێ [بڕوانەرە: سی. جی. ادموندز، کرد و ترك و عرب (ترجمة: جرجيس فتح الله)، بغداد، مطبعة التايمس، ١٩٧١، ص ١٨٧]. بەڵام لە ڕاستیدا دامەزرێنی جووڵانەوەکە شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەیە و هەر ئەویش لەو سەردەمەدا ئیرشادی کردووە. حاجی شێخ عارف خزمی شێخ عەبدولکەریم بووە و لە بارەی تەریقەت و باوەڕی ئاینی و لە ڕووی خزمایەتیشەوە زۆر لێیەوە نزیك بووە. حاجی شێخ عارف ئامۆزای سەید ئەحمەدی خانەقای کەرکووك بووە و لە نەوەی شێخ ئەحمەدی سەرداره.

## شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە

ئـەم زاتــە کـوڕی حـاجـی شێخ مستـەفـای کـوڕی حـاجـی شێخ ڕەزای عەسکەرە. هێشتا ساغ نەبووەتەوە لە چ ساڵێکدا لە دایك بووە، بەڵام وا دەردەکــەوێ لــە دەوروبــەری ١٣١٠ی کـۆچـی (١٨٩٢- ١٨٩٣ی. ز)دا هـاتووەتە دنیاوە(١) پیاوێکی گەنم ڕەنگی نیمچە باڵای دەموچاو پان بووە. زانا و خوێندەوار و تێگەیشتوو و مەلاچاك بووە. خوێندنی مەلایەتیی لای مەلا گەورەکانی ئەو سەردەمەی ناوچەی سلێمانی و دەوروبەری بووە و

(١) لە شناسنامە عوسمانییەکەی شێخ عەبدولکەریمدا، کە لە ٢٣ی مایسی ١٣٣١ی ڕۆمیدا دەرچووە، نووسراوە لە ١٢٨٨دا لە دایك بووە کە بەبەراورد لەگەڵ ساڵی زاینی ڕێکەوتی ساڵانی ١٨٧١-١٨٧٢دەکا. بەڵام ئەمە ڕاست نییە و لەوانەیە بەمەبەستی لەکۆڵکردنەوەی سەربازی وا نووسرابێ، چونکە ٢٣ی مایسی ١٣٣١ ڕێکەوتی ٢٣ی مایسی١٩١٧ دەکا کە گەرمەی شەڕ بووە. بەڵگەی ناڕاستیی مێژووەکەیش یەکەم ئەوەیە ئەو وێنەیەی شێخ عەبدولکەریم کە ئێدمۆندز لە کتێبەکەیدا بڵاوی کردووەتەوە دیارە دەبێ خۆیشی گرتبێتی کاتێ کە لە ١٩٣٦دا شەوێك میوانی بووە لە شەدەڵە، وێنەی کەسێك نییە لە ١٨٧١- ١٨٧٢دا لە دایك بووبێ [بڕوانەرە: سی. جی. ادموندز، سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٨٨ و فۆرمەی وێنەکانی نێوان لاپەڕە ٢٧٢، ٢٧٣]. دووەمیش ئەوەیە کە شێخ حوسەینی خانەقا دەڵێ: «من لە ١٣٣١ی کۆچی (١٩١٢ - ١٩١٣)دا لە دایك بووم و جیاوازیی تـەمـەنـی مـن و ئـەو ٢٠- ٢٢ ساڵـێك دەبـوو» کـە ئـەمـەیش وادەگـەیـەنـێ شێخ عەبدولکەریم لە هەڕەتی تەمەنی سەربازیدا بووە شناسنامەکەی بۆ دەرهێنراوە و بەم پێیە دەبێ لای کەمی بیست ساڵێك تەمەنی بۆ زیاد کرابێ. سەرەڕای هەموو ئـەمــە دووریشە پـیـرێـکـی شەست ساڵان بـۆ جـاری دووەم لــەو سەردەمــەدا لــە کوردستانەوە بچێ بۆ حەج. مەلا سەلامی ترێخۆریش، لە دیدارەکەیدا لەگەڵ شێخ ستار، دەڵێ: شێخ عەبدولکەریم کە کۆچی دوایی کرد تەمەنی «گەیشتبووە دەوری شەست و ئەوانە» - م. م. ك.

لای مەلا عەبدوڵڵای جەلیی کۆیی ئیجازەی وەرگرتووە[٢].

زمانی عەرەبی و فارسی و تورکیی بەباشی بەخوێندنەوە و نووسین زانیوە. دایکی ناوی ئامینەخان و کچی شێخ عەبدولسەمەدی قازییە. دوو جار چووە بۆ حەج، جاری یەکەم ساڵی ١٣٤٠ی کۆچی (١٩٢٢ی. ز) و جاری دووەم ساڵی ١٣٤٩ (١٩٣١). ئەم زاتە لە ساڵی ١٣٦١(١٩٤٢)دا لە شەدەڵە کۆچی دوایی کردووە و[٣] هەر لەوێ بەخاک سپێردراوە.

(٢) بەڵام مەلا سەلامی ترێخۆر، لە دیدارەکەیدا لەگەڵ شێخ ستاردا، دەڵێ: «بیستوومە لە کۆنەوە دەیخوێند. بەمەزەندە یەعنی عیبارەتی پێ دەخوێنرایەوە. ڕەنگە لە نەحوا تا جامی و ئەوانەی خوێندبێ. لە عیبارەتی کتێبدا عیبارەتی پێ دەخوێنرایەوە»– م. م. ك.

(٣) شایانی باسکردنە کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریم بەوە بووە شەوێکیان پاش نوێژی خەوتنان لە مزگەوتەوە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ، لە دالانی دەرگەی حەوشی ماڵدا بەردێکی تی دەگرن دەدا لە قاچی، ئێسکی دەشکێنێ و هەر بەوە پاش چل شەو کۆچی دوایی دەکا.

## بزووتنەوەی (هەقە) و تەریقەتی نەقشبەندی

بزووتنەوەی هەقە، وەك وەچەیەكی ڕێبازی سۆفیەتی، دەگەڕێتەوە سەر تەریقەتی نەقشبەندی. وەك دەزانین پاش بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام و پەرەسەندنی، واتە پاش كۆچی دوایی پێغەمبەر (د.خ) و وەچەی یەكەم و دووەمی موسوڵمانان (الصحابة والتابعون)، لە ناو موسوڵماناندا چەند ڕێبازێكی ئاینی پەیدا بوو كە پاشان تەریقەتەكانی ئەهلی تەسەوف لەسەر بناخەی ئەو ڕێبازانە هاتنە ئاراوە. یەكێ لەو تەریقەتانەیش كە پاشان لەسەر بناخەی ئەو ڕێبازانە پەیدابوون تەریقەتی نەقشبەندییە كە بەهۆی مەولانا خالیدی نەقشبەندییەوە لە كوردستاندا بڵاو بووەتەوە[١].

---

(١) هەرچەند لە كوردستاندا ناوی تەریقەتی نەقشبەندی لەگەڵ ناوی مەولانا خالید دەهێنرێ، دەركەوتووە كەوا گەلێ پێشتریش ئەم تەریقەتە لە كوردستاندا بڵاو بووبووەوە، بەڵام پاشان كوێر بووەتەوە و ناوی لە بیر چووەتەوە تا جارێكی تر لەسەر دەستی مەولانادا زیندوو بووەتەوە [بۆ زانینی زۆرتر لەم بارەوە، بڕوانەرە: محەمەدی مەلاكەریم، چمكێكی مێژووی هەورامان و مەریوان، بەغدا، ١٩٧٠، ل٢٦] –م.م.ك.

## پەیدابوونی بزووتنەوەی (هەقە)(١)

شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە، کە پێشتر باسمان لێ کرد، لە مەیدانی تەریقەتدا بەوەوە نەوەستاوە کە ڕێبازی ئاین بەساکاری، دوور لە باری

(١) شێخ حوسەینی خانەقا لە بارەی سەرەتای سەرهەڵدانی هەقەوە دەڵێ: «شێخانی هەقە، لە پێشدا وەك هەر کۆمەڵە شێخێکی تری نەقشبەندی، شێخیەتی و ئیرشادیان دەکرد، تا لە سەردەمی شێخ عەبدولکەریمدا وردە وردە لە ناو هەندێ لە مەلا - سۆفییەکانیاندا (شەتەحات) وتن دەستی پێ کرد و هەندێ لەمانە کەوتنە باسکردنی ئەوە کە کاتی سەرهەڵدانی موحەممەدی مەهدی هاتووە و لەمەشەوە وردە وردە کەوتنە گوێنەدان بە نوێژکردن و ڕۆژووگرتن و دەست هەڵگرتن لە ئیشوکار و شتی وا، بەڵکو بابەتی فەلسەفیی قووڵتریش. ئەمانە خەڵکێکیشیان شوێن کەوت. ئەمانە کە ئەم ڕێبازە نوێیەیان گرت، بەهۆی قسە و ڕەفتاری لە ناو خەڵکدا سەیر و نامۆیانەوە بە (شێت) ناوبانگیان دەرکرد و ئەوانەشیان کە لەسەر سۆفیەتییە ڕووتەکە مابوونەوە، هەر (سۆفی)یان پێ دەگوتن. بەڵام شێخ عەبدولکەریم خۆی بەمە ڕازی نەبوو، تەنانەت جارێکیشیان دارکاریی حەمەسووری لەسەر ئەوە کردووە کە دەیوت (شەرع نەماوە). شێخ لێی دەدا و دەیوت بڵێ ( ماوە)، کەچی ئەو هەر لەسەر ئەوە سوور بوو کەوا (نەماوە).

شێخ حوسەین هەروا دەڵێ: «هەندێ مەلای تری سۆفیش هەبوون ئەوانیش بەدڵ لەگەڵ ئەو یاخیبوونە بوون لە ڕێوشوێنی شەرع، بەڵام لەبەر قسەی خەڵك دەریان نەدەبڕی». شێخ حوسەین دەڵێ: «بەمجۆرە وردە وردە ناو و ناتۆرەی بێ ئاینیی هەقە کەوتە سەر زمانی خەڵك، بەڵام ڕەنگ و ڕووی پەیداکردنی ڕێبازی هەقە وەك ڕێبازێکی تایبەتی و جیاواز بەوجۆرە کە لە ناو خەڵکدا ناسراوە، لە سەردەمی مامە ڕەزا و حەمەسووردا دەستی پێ کردووە هەرچەند هەر لە سەردەمی شێخ عەبدولکەریم خۆیدا میری لێیان کەوتووەتە تەقە و شێخ عەبدولکەریم خۆی و چەند کەسی تری لێ گرتوون [وەك لەمەوپاش باسی دەکەین]».

من لەم قسانەی شێخ حوسەینەوە وام بەبیردا دێ کەوا هەروەك چۆن بزووتنەوەی =

ژیانی کۆمەڵایەتی، لە ناو خەڵکەکەی دەوروپشتیدا بڵاو بکاتەوە، بەڵکو بایەخی بەژیانی کۆمەڵایەتیش داوە. هەمیشە خەریکی ئەوە بووە کارێك بکا مریدەکانی ڕوو بکەنە چاکە و ژیانێکی پاك و دۆستانەیان لە ناو خۆیان و لەگەڵ خەڵکی تردا هەبێ و یارمەتیی خۆیان و هەموو موسوڵمانان بدەن و خۆیان لە پیاوخراپان دوور بگرن و توخنی زۆرداران نەکەون و بەربەرەکانێی هەموو جۆرە جەور و زۆر و ستەمێك بکەن. بەکورتی شێخ عەبدولکەریم تەقەلایەکی زۆری لە ناو مەنسووبەکانیدا بۆ ئەوە داوە کە ئاینی ئیسلام بەشێوەی ڕاستەقینەی خۆی و بەپێی مەبەستە ئاینییە ئەسڵییەکەی لە خەڵکی بگەیەنێ و تەنیا بریتی نەبێ لە نوێژ و ڕۆژوویەکی بەڕواڵەت.

شێخ عەبدولکەریم خۆیشی، وەك هەر خواناسێکی بەڕاست، دەستی لەگەڵ هیچ کەسێك و دەستە و دایەرەیەکی دنیاپەرست و پیاوخراپدا تێکەڵ نەکردووە، هەموو کات و توانی خۆی بۆ خزمەتی ئاین، بەوجۆرەی باسمان کرد، بەسەر بردووە، بەڵکو چەندیشی پێ کرابێ لەم ڕێگەیەدا پێوەندیی لەگەڵ هەموو کەسێکی پیاوچاك و نیشتمانپەروەر و

= سۆفیەتی خۆی تێکڕا یاخیبوونێکی سەلبیی موتەسەویفە بووە لە نەریتی ناجۆر و پڕ لە جەور و ستەمی کۆمەڵ، ئەم دەمارە لە ناو شێخان و سۆفیانی هەقەشدا بووە، بەتایبەتی کە تەریقەتی نەقشبەندی بایەخێکی زۆر بەبیرکردنەوە دەدا، بەڵام لە ڕووی ساویلکەیی و ناینەهەروەریانەوە ڕێگەی چارکردنی گیروگرفتی کۆمەڵایەتییان بەوە داناوە کە موحەممەدی مەهدی سەر هەڵبدا کە دەڵێن جیهانی پڕ ستەم پڕ دەکا لە داد. بەڵام پاشان لە سەردەمی مامە ڕەزا و حەمەسووردا – و کێ چوزانێ، ڕەنگ بێ هەر لە سەردەمی شێخ عەبدولکەریم خۆیشییەوە – هەست بەوە پەیدا بووبێ کە چاری مەسەلەکە بەهاتنی مەهدی نابێ و لەجیاتی گەڕان بەدوای دادی کۆمەڵایەتیدا لە ئاسمان، دەبێ لە زەویدا بۆی بگەڕێن، بەو جۆرە ڕێگەیان لەو جۆرە ڕێکخستنەی کۆمەڵ کەوتووە کە بۆ خۆیانیان دۆزیوەتەوە و پاشان دێینە سەری. – م. م. ك.

ئاینپەروەری ناوچەکەی و دەوروپشتیدا بەهێز بوو.

جا چونکە ئەو جۆرە ڕوانینەی باسمان کرد بۆ ئاین و سۆفیەتی، لە ناو کۆمەڵدا شتێکی باو نەبووە و بەدرێژاییی ساڵ کۆمەڵ تێکڕا وای لێ هاتووە وا لە ئاین و سۆفیەتی بگا کە ئێستا لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا لە بەرچاوە، ڕەوشتی شێخ عەبدولکەریم و مەنسووبەکانی وەکو شتێکی نامۆ و ناپەسەند هاتووەتە پێش چاو و ئەو بەناو ئاینپەروەرانەی کە ئاین دەسمایەی ژیانی دنیایانە و بەناهەق بەسەر قیامەتیدا دەبڕن، ئەم ڕێبازەی شێخیان بەزیانی خۆیان زانیوە و کەوتوونەتە پڕوپاگەندەکردن لە دژی(٢).

---

(٢) بەم هەڵسەنگاندنەی کاك مستەفادا بەئاشکرا دەردەکەوێ بەوە پاکانە بۆ هەقەکان دەکا کە هیچی بەشبەحاڵی ئاین تازەیان لا نەبووە و خەڵکی دەوروپشت بۆیە پێیان پەسەند نەکراون چونکە ئەوان ئاینیان بەڕاستی و پاکی پێ جێبەجێ نەکراوە و نەمان گێڕاویانەتەوە بۆ سەرچاوە خاوێنەکەی. ئەمە بەشێکی لە ڕاستی تێدایە، بەڵام ڕاستی لەم مەسەلەیەدا هەمووی هەر ئەمە نییە. ڕاستە بەدرێژاییی ساڵ گەلێ بابەتی خاوێن و بێ گەردی ئاین گۆڕاوە و بۆ سوودی چینە خوێنمژەکان یا بۆ گونجان لەگەڵ داوونەریتی ناوخۆی ئەو گەلانەی کە موسوڵمان بوون – دەسکاریی بەسەردا هاتووە، بەڵام وەنەبێ بشتوانین بڵێین هەر شتێکی تازەی باش بێتە ئاراوە ئەوە لە بڕبڕەی ئاینە و ئاین لە خۆیدا ئەو شتە باشەی تێدایە. ئاینیش وەك هەر دەزگایەکی تری ناو کۆمەڵ، بەرهەمی کات و ڕۆژێکە و مۆرکی ئەو کات و ڕۆژەی پێوەیە وەك چۆن خۆیشی لە دیاریکردنی مۆرك و نیشانەی کات و ڕۆژەکەدا دەور دەبینێ، بەڵام هەمیشەش لە ئاست گۆڕانەکانی ناو کۆمەڵدا پاش دەکەوێ و ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر وای لێ دێ بەفریای سەردەم نەگات و ناچار ببێ شوێنی خۆی بۆ ڕێبازی لە خۆی تازەتر و پێشکەوتووتر چۆڵ بکات.

هەر بەم پێیە دەڵێن ڕێبازی هەقە لە ڕاستیدا گەلێ شتی تازەی وای تێدایە لە ڕێبازی ئایندا نین و لەگەڵی ناگونجێن، چ لە ڕووی ئاینی ڕووتەوە وەك گوێ نەدانی هەندێکیان بەنوێژکردن و ڕۆژووگرتن، یا لە مەیدانی کۆمەڵایەتیدا وەك =

ئەم بـارە تـایـبـەتـیـیـەی ڕێبـازەکـەی شێخ، بـەشبـەحـاڵـی خـۆی، لـە نـاو

= هەڵوێستیان دەربارەی ئافرەت و هاوسانیی ئابووری و شتی وا و ناچارین وەك لە پێشەکییەکەدا پەنجەم بۆ ڕاکێشا، بڵێین تێکرا ڕێبازی هەقە گەلێ پێوەندیی بەو ڕێبازە ئاینی و فەلسەفییانەوە هەیە کە بەدرێژاییی مێژوو لە ناو موسوڵمانانـدا پەیدا بوون و لام وایە جێ پەنجەی هەندێ ڕێبازی فەلسەفیی نوێیشی پێوە بێ و تێکرا لە هەستکردن بەپێویستییە ژیوارییەکانی کۆمەڵگەیەکی جووتیارانی موسوڵمانی کوردەوە هەڵقووڵاوە.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم بڵێم ئەمڕۆ ئیتر ڕۆژی ئەوە هاتووە بوێرین لەبەر خاتری دڵ نەیەشانی هەندێ کۆڕ و کۆمەڵی کۆنەکار ڕووی ڕاستی بیروباوەڕی ئەو بزووتنەوە کۆمەڵایەتی و سیاسییانە نەشارینەوە کە لە کوردستاندا پەیدابوون و هـەوڵ بـدەیـن بـن و بـنـیـچـەی ڕاسـتـەقـیـنـە و هـۆی پـەیدابوونـیـان بـدۆزیـنـەوە و دەستنیشانیان بکەین. ئەمڕۆ ئیتر ئەو سەردەمە بەسەر چوو کە بۆچوونی کۆنی هەزار ساڵە بکەین بەسەنگ و تەرازووی هەڵسەنگاندنی هەر ئایدیا و بیرێك و لە چـاوی ئـەو بـۆچـوونـە کـۆنـەوە تـێـیـان بڕوانـیـن. زانست ئـەمڕۆ تـەنـیـا بـەو چـاوە دەڕوانێتە ئەو سەنگ و تەرازووە کۆنانە، کە هەر ئەوەندەن بەشێکن لە کەلەپووری شارستانەتیمان و ئەوانیش وەك هیی دی، چاکیش و خراپیشیان تێدایە و ئەگەر هەندێ شتیان تێدا مابێ بۆ ئەمڕۆش کەڵکیان پێوە بێ یا ژیانیان نەبێ، زۆر شتی وایشیان تێدایە دەبن بەکۆسپ لە ڕێی پێشکەوتنی وڵات و کۆمەڵدا و لە هەموو حـاڵێکدا کـردنـی ئـەو سەنگ و تـەرازووانـە بـەبڕیـاردەری چـاك و خـراپـی ڕێگـەی ژیانمان، گیروگرفتی سەختی وامان دێنێتە ڕێ ڕەوڕەوەی گەشەکردنمان دەیان ساڵ بۆ دواوە بگێڕێتەوە.

بەشبەحاڵی ڕێبازی هەقەش، هەر ئەوە بڕیاری چاکە و خراپەی دەدا، کە شوێنی لە بـزووتـنـەوەی نیشتمـانـی و نـەتـەوەیی و کۆمـەڵایـەتیمـانـدا کـامـەیـە و ئـاخـۆ تـای تەرازووی بەرەی کۆنەپەرستیی پێ قورس بووە، یا هیی پێشکەوتنخوازی؟ وەڵامی ئەم پرسیارەش پێویست نییە من لێرەدا بیدەمەوە، چونکە کاك مستەفا خۆی ئەم کتێبەی بۆ ئەم مەبەستە داناوە و منیش بێگومانم کەوا خوێندەواری بەڕێز کە لە خـوێـنـدنـەوەی تـێکستـی کـتـێبـەکـە و پـەراوێزەکـانـی و پـاشبـەنـدەکـانـی دەبێتـەوە، وەڵامەکەی بێ پێچ و پەنا دێتە ناو مشت، بەڵام ئاخۆ بەدڵیەتی یا نە، ئەوە مەسەلەیەکی ترە شتێکی کە بڕیاری دەدا – م. م. ك.

مەنسوویەکانیشدا هەروا ڕەنگی داوەتەوە و ئەوانیش بەهۆی پاشکەوتوویی باری ئاگەدارییانەوە لە ئاین و بەهۆی ناجۆریی ڕێبازەکەیانەوە لەگەڵ ڕێبازی باوی خەڵکی دەورویەریان، جۆرە هەستێکیان بەتایبەتییەتیی خۆیان تێدا پەیدا بووە. ئەمانە، وەك هەر کۆمەڵە سۆفییەکی تر، هەمیشە لە خانەقای شێخدا جەزبە گرتوونی و[3] ئاگایان لە خۆیان نەماوە و کەوتوونەتە (ئەڵلا ئەڵلا) و (یا حەق یا حەق) کردن و لە ڕوویەکی تریشەوە بەهۆی شانازیکردنیانەوە بەو ڕێبازەی گرتوویانەتە بەر، زۆر زۆر وشەی (هەق) و (هەقە)یان بەسەر زماندا هاتووە و لەمەوە لە ناو خەڵکدا بە(هەقە) یا (حەقە) ناویانگیان دەرکردووە[4].

---

(٣) یەکێ لە ئادابی تەریقەتی نەقشبەندی ڕابیتەی پیرە کە واتە دڵ بەستنەوە بەپیرەوە کە ئەوەتە سۆفی پاش دەستنوێژگرتن ڕووەو قیبلە دادەنیشێ و چاو دەنووقێنێ و بەخەیاڵ وادەزانێ پیرەکەی لە بەردەمیدا دانیشتووە و ڕۆحی پڕ نووری پێغەمبەر لە ناو دڵی یا لەسەر سینەی پیرەکەی دادەنێ و بڕیاری ئەوە دەدا کە هەمیشە نوور و بەرەکەت لای خواوە دێتە خوار بۆ سەر پێغەمبەر و لەوێشەوە دادەپەڕێ بۆ سەر دڵی خۆی و بەم جۆرە هەستی بەنوورانیبوونی دڵی خۆی تێدا پەیدا دەبێ. جا لێویشی دەنووقێنێ و زمانی لە ملاشووی توند دەکا و بەخەیاڵ وشەی (الله) بەدڵیدا دەهێنێ، وەك بەدڵ بیڵێ و لە کاتی ئەم زیکرەدا تا دەتوانێ سەرنجی ئەوە دەدا کە ڕووی لە خوایە و هەر ئەوی مەبەستە. زۆرجار سۆفی لەم حاڵەتانەدا دەکەوێتە بارێکی ناتەبیعییەوە و دەست دەکا بە هاوار هاوار و پەلکوتان و گەلێ جاریش قسەی بەپێی شەرع نابەجێ دەکا کە پێی دەڵێن (شطحات). ئەو کەوتنە باری ناتەبیعییەوە و لە ئیستیلاحی نەقشبەندییەکاندا بە (جەزبە لێهاتن) مەشهوورە. [بۆ زانینی زۆرتر لەم بابەتانەی تەریقەتی نەقشبەندی بڕوانەرە: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٧ – ١٤٧) –م.م.ك.

(٤) شێخ حوسەینی خانەقا دەڵێ: «وشەی (هەقە) بەجۆرێ کاری تێ کردبوون هەر تەقەیەکیان بەرگوێ کەوتایە و ڕاچڵەکینایە، هاواریان دەکرد: یا هەق! بەشێکی زۆری ناوی (هەقە) دەگەڕێتەوە بۆ ئەمە» –م. م. ك.

دیاره خۆیشیان ئەم ناوەیان پێ ناخۆش نەبووە و لەلایەنی خۆیانەوە کەوتوونەتە واتا لێدانەوەی و وتوویانە: ئێمە حەق پەرستین و بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕێین و(٥) ڕێگەی ئێمە حەقە چونکە ڕێگەی تەریقەتە و تەریقەتیش لە شەریعەتەوە هاتووە(٦). هەر قسەیەکی ڕاستیشیان بیستبێ و هەر کردەوەیەکی بەجێیان دیبێ، وتوویانە (هەقە) و لەمەوە وردە وردە ناوی (هەقە)یان بەسەردا براوە(٧).

(٥) ئەمە خۆی بەڵگەیەکی ئاشکرایە کەوا شێخانی هەقە شتێکی تایبەتییان لە مریدەکانیان گەیاندووە کە لە موسوڵمانانی تری سادەی بێ بیر و لێکدانەوەیان جوێ بکاتەوە – م. م. ك.

(٦) زۆر جار کە شێخەکان لە کێشە و گێرەیاندا لەگەڵ مەلاکان تێ دەگیرێن و مەلاکان تاوانی بێ شەرعیکردنیان دەدەنە پاڵ، پاساوی کاری خۆیان وا دەدەن و بەوجۆرە پاشەکشە دەکەن کە بڵێن تەریقەت لە شەریعەتەوە هاتووە، کەواتە ئێمە کە نوێنەری تەریقەتین، کارەکانمان بێ شەرعی نین –م. م. ك.

(٧) سەرەڕای هەموو ئەوەی کە وترا، من وای بۆ دەچم ناونانی کۆمەڵەکە بە(هەقە) لە شێخ عەبدولکەریم خۆیەوە بوویێ، ناونانەکەش سەرەڕای ئەو کارە سایکۆلۆجییەی دەیکاتە دڵ و دەروونی پەیڕەوەکان لە ڕووی خۆ بە ڕاست و هەق زانینەوە و ناحەزان بەناڕاست و پووچ، پێوەندییەکیشی بەپاشماوەی کۆمەڵی (ئەهلی حەق)ەوە هەبێ کە ئێستا لە گەلێ لای کوردستانی عێراق و ئێراندا هەن. لە هەموو ئەمەش زیاتر وشەی «حەقە» تێکڕا بەسەر زمانی پێشەوایانی تەسەوفەوە بووە.– م. م. ك.

## ئەو بارودۆخەی بزووتنەوەی (هەقە)ی تێدا پەیدا بوو

لەو سەردەمەدا کە شێخ عەبدولکەریم لە شەدەڵە تەریقەتی نەقشبەندیی بڵاو دەکردەوە و خەریکی دامەزراندنی بناغەی جووڵانەوەی (هەقە) بوو، بزووتنەوەی نەتەوەیی و نیشتمانی لە عێراقدا لە پەرەسەندندا بوون، بەتایبەتی لە کوردستاندا. شەڕی بەردەرکی سەرای سلێمانی نموونەیەکی باش و ئاشکرای ئەم پەرەسەندنەی بزووتنەوەی نەتەوەیی و نیشتمانی بوو لەم ناوچەیەدا. داگیرکەرە ئینگلیزەکانیش کە لە لایەکەوە شارەزای ئەوە بوون بیروباوەڕی ئاینی ئەگەر لەجیاتی ئەوەی بۆ سوودی کۆنەپەرستی بخرێتە کار، بۆ خزمەتی مەسەلەی نیشتمانی و کۆمەڵایەتی بخرێتە کار، تا چ ڕادەیەك کار لە کۆمەڵانی خەڵکدا دەکا و لە لایەکی تریشەوە لە خەڵکی تر وردتر لە کاکڵی قووڵی جووڵانەوەی هەقە و سۆفیەتیی شێخەکانی شەدەڵە دەگەیشتن و هەر لە سەرەتاوە باش لەو بنەتۆوە شۆڕشگێڕانەیە حاڵی بووبوون کە ئەم جووڵانەوەیە لە عەردی بەپیتی کۆمەڵایەتیی ناو جووتیارانی ئەو ناوچە کرێنەدا دای دەچاند.

مامۆستا ڕەووف محەمەد زوهدی لە کتێبەکەیدا (بۆ لە هەقە کەوتنە تەقە؟) لەم بارەوە نووسیویە :«خوا لێخۆشبوو شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە لە ساڵی (١٩٢٠)دا دەستی بەئیرشاد کردووە، واتە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی کە جیهان خەڵتانی خوێن بوو. هەر لەو سەردەمەدا شۆڕشی ساڵی (١٩٢٠)ی عێراق لە ئینگلیز ڕاپەڕی. پێش ئەوە بە سێ ساڵ بەرپابوونی شۆڕشی ئۆکتۆبەر و دامەزراندنی دەسەڵاتی سۆڤیەت و دەسەڵاتی هەژار و نەدار و دەنگدانەوەی بەهەموو لایەکدا هاتە ئاراوە» [تەماشای لاپەڕە (٥٢)ی کتێبی ناوبراو بکە – بەغدا، چاپخانەی (الحوادث)، ١٩٨٥].

بەڵێ لەو بارودۆخەدا بناخەی بزووتنەوەی هەقە دامەزرا، بەپشتبەستن بەچینی جووتیاران لەو ناوچانەی تێیدا بڵاو بووەوە. هەر لە سەرەتاوە بەخۆیان و نۆکەرەکانیانەوە لە گەورەپیاوانی میری لە ناوچەکە، کەوتنە هەوڵ و تەقەلادان بۆ ئەوەی جووڵانەوەی هەقە هەر لە بێشکەکەیدا بخنکێنن و نەهێڵن پەرە بسێنێ و بۆ ئەوەی شێخ عەبدولکەریم لەو بیر و سەودایە وەرگێڕن کە لەسەریدا بوو. بۆ ئەم مەبەستە زۆر کەسیان ناردە لای ئەم زاتە کە یەکێکیان مستەر ئیدمۆندزی ڕاوێژ پێکراوی وەزارەتی ناوەخۆی ئەو سەردەمەی عێراق بوو کە دووجار بەم نیازە چووەتە شەدەڵە، جاری یەکەم بەنهێنی و جاری دووەم بەئاشکرا(١).

---

(١) ئیدمۆندز تەنیا باسی یەك سەر لێدانی شێخ عەبدولکەریم دەکا [بڕوانە: سی. جی. ادموندز، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٨]، بەلام لەناو خەڵکی شەدەڵەدا باسی سەردانە نهێنییەکەیشی باوە و خەڵکی بەشێوەی کەرامەت بۆ شێخ عەبدولکەریم دەگێڕنەوە گوایە ئیدمۆندز خۆی گۆڕیوە و لە بەرگی سۆفییەکی موسڵماندا هاتووە و لە کاتی نوێژدا لە پشت سەری شێخەوە وەستاوە نوێژ بکا، بەلام شێخ کردوویەتیە دەرەوە پێی وتووە بۆ ئەو وا باشترە لەولاوە دانیشێ تا ئەمان لە نوێژەکەیان دەبنەوە. بەلام ئەو بەگوێی شێخی نەکردووە و شێخ یەك دوو جاری تری پێ وتووەتەوە تا سەرەنجام ناچاری کردووە ڕیزی نوێژەکە بەجێ بهێڵێ. دیارە لە بارودۆخێکی وەك ئەو ڕۆژانەی بزووتنەوەی هەقەدا سەیر نییە کەسێکی وریا و زیرەك و خاوەن بزووتنەوەیەکی وەك شێخ عەبدولکەریم چاوەڕوانیی هاتنی هەموو جۆرە بێگانەیەك بکا بۆ خانەقاکەی و بەشێوەی سەر و سیمادا یا بەهەر جۆرێکی تر هەندێ لەو کەسانە بناسێتەوە. ئەوەی لێرەدا پێویستە بیڵێین ئەوەتە ئیدمۆندزیش لەو شوێنەی کتێبەکەیدا کە ئێستا دیاریمان کرد گەلێ لەو درۆ و بوختانانەی دووبارە کردووەتەوە کە کەسانی ناحەز بەدەم کۆمەڵی هەقەوە هەڵیان دەبەست و هەرچەند دەیەوێ خۆی بەبابەتی پیشان بدا، بەلام ڕق و کینەی لە تایەفەی هەقە بەئاشکرا لە توێی دێرەکانی نووسراوەکەیەوە دیارە. ئەمە بەلای ئێمەوە باشترین بەڵگەی خاوێنی و نیاز بڵندیی ئەم کۆمەڵەیەیە.

ئێدمۆندز لە هەردوو جارەکەدا هەوڵێکی زۆری لەگەڵ شێخ داوە بۆ ئەوەی ڕووی پێ بکاتە میری کە ئەو کاتە لە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیز خۆیدا بوو و تەماعی زۆری خستووەتە پێش چاوی و بەڵێنی زۆری داوەتێ کە مووچەی چەور بۆ خۆی و خانەقاکەی دەبڕێتەوە، بەڵام هەموو ئەم تەقەلایانەی داگیرکەرە ئینگلیزەکان و نۆکەرە خۆماڵییەکانیان بێ سوود بوون و شێخ بەهیچ جۆرێ سەری دانەنەواند و لە ڕێگەی خۆی لای نەدا.

## گەشەسەندنی بزووتنەوەی (هەقە) و گرتنی شێخ عەبدولکەریم

بەوجۆرە کە لە بەشی پێشوودا باسمان کرد، بزووتنەوەی هەقە تا دەهات پتر پەرەی دەسەند. لە گەرمەی ئەم دۆخەدا لە ساڵی ١٩٣٤ حکوومەت شێخ عەبدولکەریمی گرت و بەدەستبەسەری لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە ئاسراوانی هەقەدا لە کەرکووك دای نا. چەند کەسێکیشی لێ دوور خستنەوە بۆ حەویجە[1] مریدەکانی شێخ کە بەمە دەزانن زۆریان لە حاڵی ئاسایی دەردەچن و جلوبەرگی خۆیان لەبەریان دادەماڵن و دەیسووتێنن

(١) یەکێ لەوانەی دوور خرابوونەوە بۆ کەرکووك حاجی شێخ عارفی سەرگەڵوو بوو. مامە ڕەزای برای شێخ عەبدولکەریمیش بۆ حەویجە دوور خرابووەوە. مامە ڕەزا جارێکی تریش لە ساڵی ١٩٤٠دا دوور خرایەوە بۆ حەویجە.

[شێخ حوسەینی خانەقا دەڵێ: «کە ئەم زاتانە گیران مەسەلەی هەقە هێشتا وای لێ نەهاتبوو ببێ بەهۆیەکی بەجێ بۆ گرتنیان. ڕاستەکەی ئەوەیە موتەسەڕیفی ئەو سەردەمەی سلێمانی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی تابوور ئاغاسی لەگەڵ شێخانی سەرگەڵوو ناکۆکیی هەبوو لەسەر موڵك. ئەو قسە و باسانەی لێ کردن بەبیانوو کە وردە وردە لە ناو خەڵکدا لە بارەیانەوە بڵاو بووبوونەوە. بڕیاری دوورخستنەوەی شێخ عارفی دا بۆ باشوور و شێخ عەبدولکەریم و مامە ڕەزا و چەند کەسێکی تریشی لێ گرتن و ناردنیە کەرکووك تا لەوێ بدرێن بەدادگا.

شایەتی درۆی زۆر و زەبەندەیش ئامادە کرابوو، بەڵام موتەسەڕیفی ئەو سەردەمەی کەرکووك جەمیل ڕاوی کە زۆر دۆستی باوکم [سەید ئەحمەدی خانەقا، باوکی شێخ حوسەین] بوو، دوورخستنەوەکەی شێخ عارفی خستە کەرکووك و مەعرووف جیاووکی سەرۆکی دادگاش هەر لەبەر خاتری باوکم، بڕیاری شەش مانگ خانەشاریەتیی لە کەرکووك بۆ دەرکرد، هەروا بڕیاری شەش مانگ خانەشاریەتیی گیراوەکانیشی دا». شێخ حوسەین هەروا دەڵێ: «باوکم ڕازی نەبوو بەڕێبازی هەقەکان، بەڵام لەبەر خزمایەتیش پشتی نەدەدان لە زەوی و قایل نەدەبوو کەس ئازاریان پێ بگەیەنێ» -م. م. ك.].

و گونیه لەبەر دەکەن و(٢) ڕوو دەکەنە کەرکووك(٣). هەرکە دەگەنە کەرکووك دەچنە سەر بەڕێوەبەریەتیی پۆلیس و بەیەك دەنگ داوا دەکەن یا شێخ ئازاد بکرێ و ڕێی بدرێ بگەڕێتەوە شوێنی خۆی، یا ئەوانیش بگرن. بەم جۆرە ژمارەیەکی زۆر لە مریدەکانی شێخ عەبدولکەریم دەگیرێن و دەخرێنە بەندیخانەوە، بەڵام پاشان حکوومەت بۆی دەردەکەوێ کەوا ئەم هەوڵەی بێ سوودە و درێژەدان بە دوورخستنەوەی شێخ دەبێتە هۆی ئاڵۆزتربوونی باری ناوچەکە، لەبەرئەوە بڕیار دەدا واز لە شێخ بهێنێ بگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی.

لە ئەنجامی ئەم ڕووداوەدا ماوەیەك کپی بەسەر ناوچەکەدا هات و جووڵانەوەکە کزییەك ڕووی تێ کرد. لەو ماوەیەدا شێخ عەبدولکەریم تەریقەتی کەسی دانەدەدا و تا کۆچی دواییشی کرد لە چەند کەسێکی کەم بەولاوە تەریقەتی کەسی دانەدا(٤)، بەڵکو پێش کۆچی دواییکردنی بڕیاری

---

(٢) مەلا سەلامی ترێخۆر، لە دیدارەکەیدا لەگەڵ شێخ ستار، دەڵێ: «ژنان لەم گونیە لەبەرکردنەدا بەشدار نەبوون و هەر جلوبەرگی خۆیانیان لەبەردا بوو» -م.م.ك.

(٣) ئەم ساڵە لە ناوچەکەدا بەساڵی گونیە ناوبانگی دەرکرد. یەکێك لەوانەی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە مریدەکاندا چوون بۆ کەرکووك مەلا ساڵحی عەسکەری بوو کە ئێستا لە مزگەوتی گەورەی کۆیە مەلایە. ئەم گونیە لەبەرکردنە جۆرە پێرەوییەك بوو لە ئەهلی تەسەووفی کۆن کە بەرگی خورییان لەبەر دەکرد و دەستیان لە دنیا دەشت و گوێیان بە جلوبەرگ و خۆراك نەدەدا و خەریکی خواپەرستی دەبوون.

(٤) بۆمان هەیە بڵێین سەرەنجام زەبروزەنگی حکوومەت بەرانبەر شێخ عەبدولکەریم بێ سوود نەمایەوە و کاری خۆی کرد و ئەم هەڵوێستەی شێخ پاشەکشەیەك بوو، واتە شێخ بەم هەڵوێستە نوێیەی ویستوویەتی تەوژمی دوژمن لە خۆی دوورخاتەوە، ئەگەر نەیشڵێین دەستبەرداری تێکۆشان بووە و ویستوویەتی داودەزگاکەی خۆی بپێچێتەوە. ئێمە کە ئێستا دەتوانین لە هەموو سەرێکەوە بۆ مەسەلەکە بڕوانین، دەبینین لەو سەردەمەدا بارودۆخی ئیمپریالیزمی ئینگلیز لە تێکرای عێراقدا بەرەو باشی دەڕۆیشت و متمانەی بەشوێنپێی خۆی لە جاران =

ئەوەیشی دابوو کە پاش خۆی کەس تەریقەت دانەدا[٥].

گوایە وەك لە ناو هەقەکان خۆیاندا باوە، مەولانا خالید کاتی خۆی وەسیەتی کردووە، دوای ئەو تەنیا تا حەوت کەس دەبیٚ تەریقەت دابدەن و لەوە بەولاوە تەریقەت دادان دەبیٚ بوەستیٚ. لە شیٚخ ئەحمەدی سەرداریشەوە تا شیٚخ عەبدولکەریم حەوت کەسەکە تەواو دەبن.

---

= زۆرتر بوو: چەند توێژێکی بۆرژوای عێراق ئالاّی خەباتیان فڕیٚ دابوو و لە ژێر پەردەی (حکوومەتی خۆماڵی)دا خۆیان دابوو بەدەستەوە و لە کوردستانیشدا بزووتنەوەی شیٚخ مەحموود بەتەواوی سەرکوت کرابوو و شیٚخ خۆیشی گیرابوو و دوور خرابووەوە. باری کوردستانی دەرەوەی عێراقیش لەمە باشتر نەبوو. بۆیە سەیر نەبوو ئەگەر کەسێکی وەك شیٚخ عەبدولکەریمیش وره بەردا و پاڵی لیٚ بداتەوە – م.م.ك.

(٥) مەلا سەلامی ترێخۆر، لە دیدارەکەیدا لەگەڵ شیٚخ ستار، لە وەلاّمی پرسیارێکی شیٚخ ستاردا لە بارەی ئەم مەسەلەیەوە دەیگێڕیٚتەوە کە چۆن لە نەخۆشیی مەرگی شیٚخدا چوویووە لای و چۆنی دیوە. ئەوجا دەڵیٚ: کە نەخۆشییەکەی درێژەی کێشا «ڕۆژیٚ گوتی: کوا، لە کوێن؟ هەر ئەوەندە، من تیٚ گەیشتم واتە شیٚخان لە کوێن؟ وتم هەریەکە لە کونێکان. وتی: بانگیان کە. چووم، وتم: مامە عەبدوڵلا، مامە ڕەزا، مامە سەلام، کاکە حوسێن، کاکە ڕەزای حاجی شیٚخ عارف! هەموو لەویٚ بوون. هەریەکە لە شوێنیٚ دانیشتبوون. کوڕەکانی خۆی! وەرن شیٚخ بانگتان دەکا و چوومەوە سەریٚ، هەموو هاتنە حوجرەکە. شیٚخ ئەوەندەی گوت: کوا؟ خۆتان بەپیاو دەزانن! کوا؟ بەهەمووتان لەم زیل و زیکە هیچتان پیٚ پاکەوە نەکرا. بەهەمووتان دەردیٚ بەسەر منەوە، دەردێکتان پیٚ سووك نەکرا. کەس دەنگی نەکرد. منیش گوتم: قوربان! مەگەر خوا. دەردی تۆ بەکەس سووك ناکریٚ. ئەوەندە هاتە وەلاّم فەرمووی ئەوا دەرکەوت هیچتان هیچ نین و هیچتان پیٚ ناکریٚ و هەرکەس بڕواتەوە ولاّتی خۆی. بۆ سبەینیٚ فەرمووی: ئێمە ئەوهای لیٚ بکەین و حکوومەت ئەوهای لیٚ بکا. ئەوا ئێمەیش تەرکمان کرد. نە کەس مەنزوونە، نە کەسیش ئیزن دەبیٚ»– م.م.ك.

## پێوەندیی شێخ عەبدولکەریم بەبزووتنەوەی نەتەوەییی کوردەوە

وەك پێشتر باسمان کرد، پێوەندیی شێخ عەبدولکەریم بەزۆر لە ناودارانی کوردەواریی سەردەمی خۆیەوە بەهێز بووە. بۆ نموونە پێش شەڕی کۆتەڵ پێوەندیی بەشێخ مەحموودی نەمرەوە بووە و بەڵێنی یارمەتیدانی داوەتێ. ئەوە بوو لەو شەڕەدا ژمارەیەکی زۆر لە خزمانی شێخ عەبدولکەریم و لە عەشایری ناوچەی ئاغجەلەر بەفەرمانی شێخ و بەسەرۆکایەتیی شێخ عەبدوڵلای برای لەگەڵ کاکەڕەزای کوڕی کاکە عەلی عەسکەریدا، شاخی گەورەدێیان بۆ پاڵپشتی لەشکری شێخ مەحموودی نەمر و ڕێگرتن لە هێرشی سوپای ئینگلیزەکان لەو ناوچەیەوە بۆ سەر کۆتەڵ - گرت و تا شەڕ کۆتایی نەهات، هەروەك شێخ مەحموود فەرمانی دابوونێ، سەنگەری خۆیانیان چۆڵ نەکرد. هەر بەم هۆیەیشەوە بوو گوندی شەدەڵە بۆمباباران کرا و ماڵ و منداڵی شێخ عەبدولکەریم ناچاربوون گوند بەجێ بهێڵن و بچنە ئەشکەوتی «بۆڵەترێ» لە پشت شەدەڵەوە لە شاخی (دابان) و پاش ئەوەیش چوونە ناوچەی مێرگەپان.

## بزووتنەوەی (هەقە)

## پاش کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریم

پاش کۆچی دواییکردنی شێخ عەبدولکەریم، بەشێك لە مریدەکانی وازیان لە هاویەشیکردنی کۆمەڵەکەیان هێنا، بەڵام ئێستا هێشتا هەر زیارەتی شەدەڵە دەکەن، واتە ئەمانە بوون بە کۆمەڵە سۆفییەکی تەنیا بەدیمەن ئاینی وەك هەموو ئەو سۆفی و دەروێشانەی لە کوردستاندا هەن. ژمارەیەکی کەمیشیان دوای حەمەسوور کەوتن(١) و لە گوندی کلاوقوت لە ناوچەی شوان نیشتەجێ بوون(٢).

(١) حەمەسوور لە بنەماڵەی شێخەکان نییە، ڕەشە مسکێنە. کاتی خۆی ماوەیەکی زۆر لە ماڵی شێخ عەبدولکەریمدا دارکێش و گۆلکەوان بووە، پاشان تەریقەتی وەرگرتووە و لەگەڵ سۆفی و مریدەکانی تردا هەڵساوە و دانیشتووە و بەوجۆرە وردە وردە هەڵکەوتووە تا بووە بەیەکێ لە پێشەوایانی هەقە.
[مەلا سەلامی ترێ خۆر، لە دیدارەکەیدا لەگەڵ شێخ ستار، لە بارەی بن و بنەچەی حەمە سوورەوە دەڵێ: «باوکی ناناسم ، باپیریشی ناناسم. باسیان ئەوەندە کردووە وتوویانە خەڵکی لای ئالان و سیوەیلە». لە بارەی خوێندەواری و نەخوێندەواریشیەوە دەڵێ: «حەرفی نەخوێندووە. شیعر و شتیشی زۆر لەبەرە. وەختی خۆی لەگەڵ مەلا و فەقێ و شتی وادا موحاوەرەی بووە»—م.م.ك.]
(٢) مامۆستا هەمزە عەبدوڵا دەڵێ: «حەمەسوور پاش مردنی شێخ عەبدولکەریم مێزەرەکەی لە سەری خۆی دەنێ و جبەکەی لەبەر دەکا و بانگەشەی شێخیەتی دەکا، بەڵام شێخەکان ملی بۆ کەچ ناکەن و لە شەدەڵە دەری دەکەن. ئەویش دەچێ بۆ ناو شوان و پاشان دەچێ بۆ کەرکووك بۆ لای سەید ئەحمەدی خانەقا، ئەویش هەروا نایگرێتە خۆی و گوناهی (بیدعەت داهێنان)ی دەداتە پاڵ و دەری دەکا. ئیتر ئەویش لەگەڵ دەستە و دایەرەکەی خۆی دەچێتە کلاوقوت و لەوێ سەقامگیر دەبێ».
بەڵام مەلا سەلامی ترێخۆر، لە دیدارەکەیدا لەگەڵ شێخ ستار، دەڵێ: «کە (شێتی) =

بەشی زۆرترەکەشیان مامە ڕەزای برای شێخ عەبدولکەریمیان هەڵبژارد و کردیان بەسەرۆکی خۆیان(٣).

هەروەك لە پێشەکیی ئەم چاپی دووەمەدا باسم کرد کاتی خۆی ئەم کتێبە زۆر بەکورتی نووسراوە. یەکێکیش لە باسەکان کە بەکورتی نووسراون، ئەو ناکۆکییەیە کە دوای کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریم پەیدا بوو. لە ڕاستیدا ئەو ناکۆکییە بوو بەهۆی بڕبوونی بزووتنەوەی هەقە بۆ چەند بەشێك:

= پەیدابوو، حەمەسوور یەکێ بوو لە شێتەکان و شێخ عەبدولکەریم بەشێتییەکەی ئەو ڕازی نەبوو(؟). هەندێکیشی لێ دا و پێی وت: بڕۆ لە کۆڵمان ببەوە. لە دنیا و قیامەت تۆ هاوڕێی ئێمە نیت، لە پۆلی ئێمە نیت. ئیتر لەو وەختەوە ئەم حەمەسوورە بۆ خۆی بازنەیەکی لەو مریدانەی شێخ عەبدولکەریم دابڕیوە و هاتووە لە کلاوقوت وردە وردە دەستی کردووەتە نیشکردن، موڵکی لە خەڵك کڕیوە و بووەتە خاوەن موڵك».
بەپێی ئەم قسانەی مەلا سەلام دەبێ حەمەسوور لە پێش کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریمەوە لە کلاوقوت نیشتەجێ بووبێ و ئەگەر بمانەوێ ئەم قسەیە لەگەڵ قسەکەی پێشەوەی مامۆستا هەمزە عەبدولادا یەك بخەین، دەبێ بڵێین بەبۆنەی کۆچی دوایی شێخەوە چووەتەوە بۆ شەدەڵە و ویستوویە جێی شێخ بگرێتەوە، بەلام کە بۆی نەچووەتە سەر گەڕاوەتەوە بۆ کلاوقوت –م. م. ك.

(٣) مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا دەڵێ: «پاشان شانێکی دەستەڕاستیش بەسەرۆکایەتیی شێخ عەبدوڵلای شێخ مستەفای عەسکەر دامەزرا کە داوای دامرکانەوە و دانیشتنیان دەکرد. ئەمانە شانێکی دەرەبەگی مەشرەب بوون و ڕێگەی گونجانەوە و تێکەڵبوونەوەیان لەگەڵ داودەزگاکانی سەردەمدا گرتبووە بەر». مامۆستا هەمزە هەروا دەڵێ: «بەلام پاشان هەموو لایەك دانیان بەوەدا نا کە مامە ڕەزا جێنشینی حەقی شێخ عەبدولکەریمە».
منیش دەڵێم: وا دەردەکەوێ شێخ عەبدوڵلا ئەم شانەی پاش دەرکەوتنی ڕێبازی حەمەسوور و مامە ڕەزا پێکەوە نابێ و بەدرێژەپێدانی ئەو ڕێگەیەی دانابێ کە شێخ عەبدولکەریم لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا، واتە لە پاش بەربوونیەوە لە زیندانی کەرکووك، گرتیە بەر» –م.م.ك.

١- بەشێك لە مریدەکان هەروەك سۆفیگەلێکی سادە مانەوە و هاتوچۆی شەدەڵەیان دەکرد. ئەوانە زۆرتر سەر بەکوڕانی شێخ عەبدولکەریم بوون.

٢- بەشێك بەناوی (حەماغایی) کە حەمە ئاغای پشدەر سەرکردەیان بوو. ئەوانە زۆرتر نیشتەجێی گوندی (کانی توو) بوون، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت حەماغا وازی هێنا و چوو بۆ سەردانی گۆڕی شێخ عەبدولکەریم لە شەدەڵە و دوای گەڕانەوەی کۆچی دوایی کرد و کۆمەڵەکەی تێك چوو.

٣- بەشێکی تر سەر بەسەرۆکایەتیی شێخ عەبدوڵڵای کوڕی حاجی شێخ مستەفای عەسکەر بوون کە برا گەورەی شێخ عەبدولکەریم بوو، سەری هەڵدا. ئەمانیش ژمارەیان کەم بوو. زۆرتریان کوڕە شێخ بوون و هەر زوو دەستیان لەو کارە هەڵگرت، ئەگەرچی بەتەواویش تێکەڵی کۆمەڵەکەی مامە ڕەزا نەبوون.

٤- بەشێکیشیان دوای حەمەسوور کەوتن و لە (کلاوقوت) نیشتەجێ بوون.

٥- بەشی زۆریش ڕوویان کردە مامەڕەزای برای شێخ عەبدولکەریم. پاش ئەوەی بەشی دووەم و سێیەم کشانەوە، بەشی پێنجەم واتە ئەمانەی دوای مامە ڕەزا کەوتبوون پەرەی سەند و بوو بەکۆمەڵی سەرەکی. تاقمی حەمەسووریش هەر ئەوەندە مانەوە کە لە گوندی (کلاوقوت) بوون. نەیاندەهێشت منداڵیان ببێ. خەریکی کار و کاسبی و کشتوکاڵ و هۆنینەوە و فرۆشتنی تەزبیحی قەزوان بوون. بیانووی حەمەسوور بۆ نەهێشتنی منداڵبوون ئەوە بوو گوایە منداڵ خراپە چونکە خوا لە قورئاندا فەرموویەتی: «واعلموا انما اموالکم واولادکم فتنة وان الله عنده اجر عظیم» (سوورەتی الانفال، ئایەتی ٢٨) و چەندین ئایەتی تریش.

هەرچەند هەوڵێکی زۆرم دا و تەقەلام کرد نەگەیشتمە هیچ ئەنجامێك لە

بارەی ئەم مەسەلەیەوە، چونکە بەهیچ جۆرێك تاقمی حەمەسوور ئەم کارەیان ئاشکرا نەدەکرد کە ئەم منداڵبوونەیان چۆن لە ناو خۆیاندا قەدەغە کرد، بەچ شێوەیەك؟ بەهۆی ئەم قەدەغەکردنی منداڵبوونەوە وهەروەها بەهۆی بارودۆخی کوردستان و پرۆسەی لەناوبردنی بەکۆمەڵی کوردەوە لە ئەنفالەکاندا کە ئەو ناوچەیەی زۆر بە خەستوخۆڵی گرتەوە کە حەمەسوورییەکانی تێدا دەژیان، کەسیان نەما و هەموویان لەناوچوون تەنیا چوار ژن نەبێ کە ئێستا لە ئۆردووگای شۆڕش دەژین لە چەمچەماڵ. حەمەسوور خۆیشی لە ۱۹۸٦دا کۆچی دوایی کرد.

هەندێك لە تاقمەکەی حەمەسوور لە دێهاتی قۆمەرغان و قەرانگوێ بوون لە ناوچەی سووورداش. ئەمانە خوویان دایە بەهێزکردنی ئابووریان و سندووقێکی هاوبەشیان دانا و وازیان لە چاخواردنەوە و جگەرەکێشان هێنا و جلوبەرگی سادە و ساکاریان لەبەر دەکرد و ڕیشیان دەهێشتەوە و دەستیان کرد بەکاسبی و تەزبێح هۆنینەوە، بەڵام حەمەسوورییەکانی تر لە ڕێباز و هەڵوێستدا هەروەك هەقەکانی تری سەر بەمامە ڕەزا بوون، ئەوەندە هەبوو ئەمان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا تا ڕادەیەك کەم تێکەڵاوی و لە خەڵکی تر دوورەپەرێز بوون(٤).

بەهۆی ئەم دووبەرەکییەوە کە پاش کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریم کەوتە ناو تایفەی هەقەوە، ناحەزان لە جاران باشتر پێیان کرا

---

(٤) لام دوور نییە ئەم دوورەپەرێزییەی تاقمەکەی حەمەسوور لەوەوە هاتبێ کە حەمەسوور خۆی، وەك گوتمان، ڕەشە مسکێن بووە و تێکەڵاویکردنیش چوونە ناو کاروباری ئەوێ و، ئەوەش دەبێ پشت بەزەوینەیەکی کۆمەڵایەتیی پتەو ببەستێ کە حەمەسوور بەپێی داوونەریتی کۆمەڵ نەیبووە. سەرەڕای ئەوە کە تاقمی حەمەسوور، لە ناو هەموو تاقمەکانی هەقەدا، لە هەموویان ناحەزیان زۆرتر بووە، دیارە ئەمەش لای ئەمانەوە دەبێ بەهۆی دوورەپەرێزیی زیاتر لە خەڵك —م.م.ك.

پڕوپاگەندەیان لە دژ بکەن و درۆودەلەسەیان بەدەمەوە هەڵبەستن و میرییان لێ هان بدەن. ئەمە گەلێ جار بەپێی پێویست و بەگوێرەی قازانجی ئەوانەی قازانجیان تێدا بوو، دووبارە بووەوە، کە دواجاریان ئەوە بوو وتیان گوایە حەمەسوور بانگەشەی پێغەمبەریەتی دەکا و ئافرەتی کەسی لا حەرام نییە و سۆشیالیزم بڵاو دەکاتەوە و سەرەنجام لە ١٩٥٧دا حکوومەتی ئەو سەردەمە گرتی و دای بەدادگا، بەڵام پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمووز و ئاوکەوتنی ئاشی بەرەی کۆنەپەرستی، حەمەسووریش پاش ماوەیەکی زۆر بەندی و کێشمەکێش لە بەردەم دادگادا بێ گوناه دەرچوو و بەرەڵا کرا و گەڕایەوە کلاقوت و نێستاش هەر لەوێ دەژی(٥).

---

(٥) حەمەسوور بەپێی ئەوەی کە پێشتر وترا لە بنەماڵەی شێخان نییە و لە ڕیشەی کۆمەلایەتییەوە دەچێتەوە سەر جووتیارانی ڕەنجکێش، لەوانەیە بەکردەوە باسکراوەکانیدا وای هەڵسەنگێنین کە نوێنەری هێڵێکی ڕادیکاڵی مەشرەبە لە بزووتنەوەی هەقەدا، لەگەڵ دەمارێکی خەستی لە هەڵکەوت و باری دەوروبەر نەگەیشتن. کەفوکوڵ دامردنەوەی زوو بەزوویشی ئەم ڕایەمان زیاتر دەچەسپێنێ. مامۆستا هەمزە عەبدوڵایش لایەنی ئەم ڕایە دەگرێ و بەرەی حەمەسوور بەبەرەیەکی (چەپڕەو) دەداتە قەڵەم. هەرچۆن بێ ئەم پیاوە لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ، تێکڕا، پیاوێکی دڵسۆز و لایەنگری کۆڕ و کۆمەڵە نیشتمانپەروەرەکان بووە–م.م.ك.



مامە ڕەزا

١٩٥٣ کاتی نەخۆشی

# مامە ڕەزا

مامە ڕەزا ساڵی ١٩٠٥ لە شەدەڵە لە دایك بووە. پیاوێکی گەنمڕەنگ و بەشەوکەت بووە. مرۆیەکی لەسەرخۆ و قسەخۆش و تێگەیشتوو بووە. زمانی عەرەبی و فارسیی زانیوە. لە ئەدەبیاتی کوردی و فارسیدا شارەزاییی بووە. تا ڕادەیەکی باشیش ئاگەداریی لە مێژووی گەلی کورد و گەلانی موسوڵماندا بووە. لە ژیانیدا گەلێ جار تووشی بەندی و ئەشکەنجە و ئازار و دوورخستنەوە بووە. لە سەرەتای ژیانیدا خوێندنی حوجرەی بووە. پیاوێکی هاوچەرخ و بیروباوەڕ پێشکەوتوو بووە. حەزی بە چاکە و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی گەلی کورد و چینە چەوساوەکانی کردووە. لەگەڵ پیاوە دەرکەوتووەکانی کوردی سەردەمی خۆیدا پێوەندیی بەهێز و، گفتوگۆی لەگەڵ زۆریاندا بووە. بەتایبەتی لە ماوەی دوورخستنەوەیدا بۆ عەمارە پێوەندییەکی پتەوی لەگەڵ میر حاجدا پەیدا کردووە و هەر ئەو پێوەندییەش بووە لە دواییدا بوو بە مایەی پێوەندیی پەیداکردنی هەقەکان لەگەڵ کۆماری مەهاباددا.

مامە ڕەزا لەسەر ڕێبازی شێخ عەبدولکەریم ڕۆیشتووە، بەڵام لەو زیاتر ڕووی کردووەتە خزمەتی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵی هەقەی بەرەو بیروباوەڕی پێشکەوتخوازی و نیشتمان پەروەری بردووە. پێوەندیی لەگەڵ بزووتنەوەی نەتەوەییی کورددا بەهێز بووە.

لە سەردەمی کۆماری مەهابادا دەستەیەك لە هەقەکانی ناردووە بۆ مەهاباد بۆ بەشداربوون لە کاروباری کۆمارەکەدا. ئەم دەستەیە بە سەرۆکایەتیی شێخ موحەممەد ئەمینی مەڵحە[1]بووە. پێك هاتووە لە (٤٠)

(١) شێخ موحەممەد ئەمینی مەڵحە کە بەناوی گوندی مەڵحەی ناوچەی حەویجەوە =

کەس (٥) کەسیان خەڵکی گوندی سەرگەڵوو بوون: شێخ موحەممەد مستەفا ناسراو بە کاکە دینە، شێخ سەلیمی شێخ ئەحمەد، شێخ ئەبووبەکری شێخ عەبدوڕەحمان و دوو کەسی تریش. (٦) کەسیشیان خەڵکی گوندی (کوێرەکانی) بوون: عەبدوڵڵا وەیسی، حاجی محەمەد ئەمینی محەمەدی کوێخا ئەحمەد و چوار کەسی تریش. (٥) کەسیشیان خەڵکی (هەنجیرە) بوون: محەمەدی کوێخا عەزیز، کوێخا عەبدوڵا و (٣) کەسی تر. (٤) کەسیشیان خەڵکی (خۆشاو) بوون: ئەحمەدی حاجی محەمەدی سلێمان، عەبدوڵڵای حاجی عەزیز و دوو کەسی تر. (٣) کەسیشیان خەڵکی (کانی توو) بوون: خدر قادر، حوسێن عەلی و برایەکی تریش. ئەوانی تر هەریەکە خەڵکی یەکێك لە گوندە هەقەنشینەکان بوون: مەحموودی حەمە گەورە (مەلا سەفی)، ڕەشیدی مەحموودی ئیبراهیم (توربە)، ئەحمەد عەزیز قادر ناسراو بە ئەحمەد پینەچی (هەڵەدن)، قادر فەرەج (قۆمەرغان)، حوسێن قادر (دێرێ)، حوسێنی مام ئەحمەدە سوور (سێدەر)، کەریم ڕەشید (کلێسە)، قادر عەبدوڵا (کانی ئەسپان)و کەسانی تریش کە ناوەکانیانم بۆ ساغ نەبووەوە.

سەرنج ڕاکێشە ئەمە کە مامە ڕەزا پیاوێکی ئاشتیخواز بووە. هەقەکانیش چەکیان هەڵنەدەگرت، بەڵکو دارێکیان بە دەستەوە بوو لەجیاتی چەك، بەڵام لەگەڵ ئەو باوەڕە پتەوەیشدا بەئاشتی، مامە ڕەزا ئەو پۆلە چەکدارەی ناردووە بۆ پاراستنی کۆماری مەهاباد و لە بەڕێوەبردنی کاروباریدا بەشدار بوون، چونکە ئەوکارە لەو قۆناغەدا پێویست بوو بۆ خەباتی نەتەوەیی و نیشتمانی و پاراستنی ئەو کۆمارە کە بە چەك نەبوایە نەدەکرا.

---

= ناوویانگی دەرکردووە، یەکێك بووە لە خزمانی سەید ئەحمەدی خانەقای کەرکووك و برای شێخ سەعید بووە. پیاوێکی کارامە و لێهاتوو بوو، لەبەرئەوە مامە ڕەزا کردی بە یارمەتیدەری خۆی و تا ساڵی ١٩٥٠یش یەکێك بوو لە هەرە نزیکەکانی.

هەروەك باسمان كرد مامە ڕەزا باوەڕی بەئاشتی بوو، هەقەكان هێز و توندوتیژییان بەكارنەدەهێنا. لەو ڕێ ڕۆیشتنەشیاندا كە دوایی باسی دەكەین، ئامێری دەستیان تەنیا هەر دار بوو بەدەستیانەوە.

مامە ڕەزا (بانگەوازی ستۆكهۆڵمی بۆ ئاشتیی جیهان) ئیمزا كردبوو. مامۆستا ڕەئووف محەمەد زوهدی لە لاپەڕە (١٧٤)ی (بۆ لە هەقە كەوتنە تەقە)كەیدا دەڵێ: پێشكەوتووخوازان لێیان ڕاپەڕین. لە شاری ستۆكهۆڵمدا لە سوید، مافپەروەرانی دیموكراتی جیهان مانیفێستی ئاشتی و پاراستنی ئاشتیی جیهانیان ئیمزا و بڵاو كردەوە. كۆمەڵانی خەڵك لە ڕۆشنبیران و هونەرمەندان و پیاوماوقوڵان لە ئەورووپا و ئاسیا و ئەفریقیا و ئەمەریكا و ئوسترالیادا بە گەرمی پێشوازیی ئەو بەیاننامەیەی ئاشتییان كرد و بناخەی ئاشتیی نێو دەوڵەتانیان دارشت. تاد.

خوالێخۆشبوو (مامە ڕەزا) یەكێك بوو لەوانەی كە بەویەڕی سۆزەوە لەم ڕێبازەدا (ڕێبازی ئاشتی و پاراستنی ئاشتیی جیهان) وەكو شەخسیەتێكی ئاغر و دوورئەندێش بەشدار بووە و تێ كۆشاوە.. تەنانەت بۆ ئەم مەبەستە كەسانێكی لە تاقمەكەی خۆی تەرخان كردووە، وەكو مەلا سابیری سۆفی محەمەد.

كاتی گەڕانەوەی ئەو پۆلە هەقەیەی بەشداربوون لە كۆماری مەهابادا بۆ كوردستان دوای لە ناوچوونی كۆمارەكە، خوا لێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزانی نامەیەكی بۆ مامە ڕەزا ناردبوو ستایشی بەشداریی هەقەكانی لە كۆماری مەهابادا كردبوو. هەروەها سوپاسی مامە ڕەزای كردبوو كە پشتگیریی شۆڕشی بارزانی ساڵانی ١٩٤٣ – ١٩٤٤ی كردبوو و ڕۆڵی مامە ڕەزای لە پشتگیریی خەباتی گەلی كورددا، بەرز نرخاندبوو. بە داخەوە ئەو نامەیە فەوتاوە.

هەروەها پێوەندیی لەگەڵ بزووتنەوەی نیشتمانیی عێراقیشدا باش بووە.

لەمبارەیەوە بەڕێز عوسمان مستەفا خۆشناو لە کتێبەکەیدا (گەلا وەریوەکان، لاپەڕە ١٣٧-١٤١، چاپی یەکەم، چاپخانەی شەهاب، هەولێر) نووسیویە کە چووەتە هەڵەبجە بۆ خزمەت مامە ڕەزا، کاتێ کە دوور خرابووەوە بۆ ئەوێ و داوای لێ کردووە وا بکا ژمارەیەك لە کەسانی سەربە حیزبی شیووعی لە خەڵکی شارەکانی سلێمانی و هەڵەبجە و هەولێر، کە لە لایەن حکوومەتی ئەو سەردەمەی عێراقەوە هەوڵی دەستگیرکردنیان درابوو، لە لادێکانی سەربە حەقە بحەوێنەوە. مامە ڕەزایش بەڕووخۆشییەوە فەرموویەتی: بیانبەنە گوندی (چنارتوو) لە ناوچەی ئاغجەلەر، با لەوێ بمێننەوە چەندی پێویست بێ، بەلام ئامۆژگارییان بکەن ئاگایان لە داونەریتی کوردایەتی بێ و بەرچاوی بگرن.

ئەم قسانەی بەڕێز عوسمان مستەفا خۆشناو بەڵگەیەکن کە پێوەندیی مامەڕەزا بە هێزە نیشتمانپەروەرەکانی ناو کوردستان و عێراقەوە بەهێز بووە و هاوکاریی لەگەڵدا کردوون.

ئەم پێوەندییە دوای کۆچی دوایی مامە ڕەزایش هەر بەردەوام بووە. لە سەردەمی کاکە حەمەی کوڕی مامە ڕەزادا کە بووبوو بە جێگرەوەی باوکی، کاتێ کە کودەتا خوێناوییەکەی بەعسییەکان ڕووی دا لە شوباتی ١٩٦٣دا، ژمارەیەکی زۆر لە شیووعی و دیموکرات و نیشتمانپەروەرەکان لە هەموو ناوچەکانی عێراقەوە ڕوویان کردە کوردستان و چوونە پاڵ شۆڕشی کورد. هەقەکان لە (کەڵکە سماق) بە گەرمی پێشوازییان لێ کردن و خزمەتیان کردن تا هەوری ڕەشی کوودەتاکە ڕەوییەوە و ئەوانیش گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان و بۆ ناو کەسوکاریان خۆیان.

هەروەها هەقەکان خۆیشیان لە ١٩٣٦ بەدواوە بەشداریی هێزی چەکداری شۆڕشی کوردیان کرد، چونکە لەو ساڵە بەدواوە پاراستنی گەلی

کورد بوو بەئەرکێك لە ڕێگای شۆڕشی چەکدارەوە نەبوایە نەدەکرا. لە شەڕی (سەری حەسەن بەگ) و شەڕەکانی تردا بەشدارییی بەرچاویان هەبوو. لە شەڕی سەری حەسەن بەگدا تەها عەسکەریی کوڕی مامە ڕەزا سەرکردەییی جەنگاوەرەکانی هەقەی دەکرد و لەگەڵ حیزبی شیووعیدا هاوکارییان هەبوو و سەرکەوتنی گەورەیان بەدەست هێنا. دوای ئەوەیش لەلایەن سەرکردایەتیی شۆڕشەوە لقێکی تایبەتی بۆ هەقەکان بەسەرکردایەتیی شێخ عەبدولحەمیدی کوڕی مامە ڕەزا کرایەوە. ئەم لقە لە چەندین شەڕدا دژی داگیرکەرانی کوردستان جەنگاوە. ماوەیەکیش شێخ حەسیبی کوڕی شێخ عەبدولقادری قازی سەرکردەی ئەم لقە بوو و چەندین نەبەردیان تۆمارکرد.

مامۆستا کەریم ئەحمەد لە کتێبی (المسیرة)دا کە بەڕێز جەلال دەبباغ بەناوی (ڕێڕەوی تێکۆشان) وەری گێڕاوەتە سەر کوردی و لە چاپخانەی (ڕەهەند) لە سلێمانی لە ٢٠٠٧ دا لە چاپ دراوە. باسی پێوەندیی مامە ڕەزای بەناشتیخوازان و بەحیزبی شیووعییەوە کردووە، بەڵام زۆر بەکورتی. هەروەها زۆر بەکورتیش باسی بنکەی کەڵکە سماقی کردووە کە لە ١٩٦٣دا بنکەی پێشمەرگە شیووعییەکانی لێ بووە، بەڵام پێویست بوو زۆرتر ئەو پێوەندییەی نێوان ئەو شیووعییانە و هەقەکانی ڕوون بکردایەتەوە وەك وەفادارییەك بەرانبەر بەو خزمەتە زۆرەی هەقەکان بەو پێشمەرگە شیووعییانەیان کرد و حەواندنیاننەوە و هەقەکان بەهۆی ئەوەوە تووشی گیروگرفت و چەرمەسەرێی زۆر بوون.

لە شۆڕشی نوێیشدا بەسەرکردەییی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەقەکان بەڕابەرایەتیی کاکە حەمەی مامە ڕەزا هاوکارییەکی باشی شۆڕشیان کردووە.. لە سەرەتای شۆڕشدا کاکە حەمە ژمارەیەك چەکداری نارد بۆ یارمەتیدانی شۆڕش کە بەشی زۆریان لە ساڵانی سەرەتای

شۆڕشدا شەهیدکران و بوون بەقوربانیی خەباتی گەلی کورد. بۆیە سەرلەنوێ تیپی ژمارە (٢٩)ی هەقەکان دامەزرێنرایەوە کە لەبەشی زۆری شەڕەکاندا بەشداریی کرد و لە پرۆسەی ئەنفالدا هاوشانی پێشمەرگەکانی یەکێتی جەنگان و چەندین قوربانییان دا کە یەکێك لەوانە شەهید هەژاری کوڕی شەهید سالّح عەسکەری و یەکێکی تریشیان شەهید عەبدوڕەحمان ڕەشیدی جێگری بوو کە لەسەر لووتکەی قولّە پووشین لە شاخی پیرەمەگروون شەهید کران.

وەك لە سەرەتادا باسم کرد لە کاتی سەرهەلّدانی هەقەوە کە شێخ عەبدولکەریمی شەدەلّە و حاجی شێخ عارفی سەرگەلّوو پشتگیریی شۆڕشی شێخ مەحموودی نەمریان کرد، ئەم پشتگیرییەی خەباتی نەتەوایەتی لە هەموو قۆناغەکاندا هەر بەردەوام بووە. لەسەرەتای چلەکانی سەدەی ڕابوردوودا کاتێك شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفای بارزانی لە سلێمانی بوون، شێخانی هەقە بەهۆی یەکێك لە مریدەکانیانەوە کە حاجی محەمەد ئەمینی کوێرەکانی بوو، پێوەندییان لە گەلّیاندا پەیدا کرد و یارمەتییان دەدان. دوای ئەویش مامە ڕەزا هەر بەردەوام بوو لەو پێوەندییەدا. کاتێك شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا گەڕانەوە بۆ ناوچەی بارزان و شۆڕشی بارزان سەرلەنوێ دەستی پێ کردەوە، مامە ڕەزا پشتگیریی تەواوی لەو شۆڕشەدا کرد و یارمەتیی دا. فەرمانیشی بەو هەقانە دا کە لە سوپای عێراقدا بوون بەهیچ جۆرێك تەقە لە شۆڕشگێڕان نەکەن. شێخ ئیسماعیلی مامە حوسێن کە برازای مامە ڕەزا بوو و ئەو کاتە سەرباز بوو لە سوپای عێراقدا، لەسەر ئەم مەسەلەیە تووشی کێشەیەکی زۆر بوو.

هەر ئەم پێوەندییانە بوونە هۆی ئەوە کە شێخ ئەحمەدی بارزان لە سالّی ١٩٥٩دا سەری لە مامە ڕەزا دا لە کەلّکە سماق کە لەو کاتەدا نەخۆش بوو، هەروەها مەلا مستەفای بارزان لە سالّی ١٩٦٧ دا چووە

شەدەڵە و چەند ڕۆژێك میوانی کوڕانی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە بوو و داوای حاجی محەمەد ئەمینی کوێرەکانیی کرد چاوی پێ بکەوێ و کە حاجییش چووە خزمەتی، ڕێزی زۆری لێ ناو یادی ساڵانی ڕابردووی پێکەوەیانیان کردەوە.

لە کاتی دەستبەسەر خوا لێخۆشبوو حەمەڕەشید خانی بانەیشدا لە کەرکووك، کە کاتی خۆی یەکێك بووە لە سەرکردەکانی کۆماری مەهاباد و پلەی جەنەراڵیی پێ بەخشرابوو لەو سەردەمەدا، مامە ڕەزا و کاکە ڕەزای کاکە عەلی بۆ پیرۆزیی ئەو یادە سەریان لی دا و پێوەندییان هەبوو لە تەکیدا.

بەهۆی ئەم پێوەندییانە و ئاسۆ فراوانیی خۆیشیەوە، مامەڕەزا گەیشتبووە ئەو باوەڕە کە دەبێ کۆمەڵی هەقە بە شێوەیەکی نوێ ڕێك بخرێتەوە و شێوەی خەباتی کۆمەڵایەتی بەبزووتنەوەکەیان بدرێ و لە چوارچێوەی تەسکی سۆفیگەری ببرێتە دەرەوە[٢]. بۆ بەدیهێنانی ئەم

(٢) من لام وایە هۆیەکی گەورەی بیرکردنەوەی مامە ڕەزا لە ڕێکخستنەوەیەکی نوێی بزووتنەوەی هەقەدا ئەوە بووە بزووتنەوەکە تا ئەو کاتە وەك بزووتنەوەیەکی ئاینی و سۆفییانە ناوبانگی دەرکردبوو، بەڵام لە سنووری شەرع دەرچوونی زۆر لە سۆفی و مریدەکان بەتایبەتی لە حاڵی جەزبەدا و ئەو گفتوگۆ و دەمەتەقێ فەلسەفییانەی لەناو ڕیزەکانیانا بووبوو بە باو، مەسەلەکەی خەست کردبووەوە و کار گەیشتبووە ڕادەیەك هەقە وەك کۆمەڵێکی لە ئاین دەرچوو ناوبانگ دەرکەن و لەم بەینەدا شتە سەرەکییەکەی هەر بزووتنەوەیەك کە لە بنەڕەتا بۆ ئەوە پەیدا دەبێ با پێیشی نەزانرێ، کە ڕێکخستنەوەی ژیانی کۆمەڵایەتییە، بە شێوەیەکی خراپتر لە جاران کەوتبووە دواوە. لەولاوە ئەو دووبەرەکییەی لەسەر دەستی حەمە سوور پەیدابوو لەناو بزووتنەوەکەدا پاش کۆچی دواییی شێخ عەبدولکەریم، مەترسیی ئەوەی خستبووە بەردەم دەستەی مامە ڕەزا کە لە کاتێکدا لەم لا خەڵکەکە زیاتر خۆیان بە بەلەسەبوون لە دا ونەریتی شەرعەوە خەریك کردووە، لەولا (واتە لای=

مەبەستە چەند خاڵێكی كرد بە بناخەی دامەزراندنەوەی كۆمەڵەكە.[٣]

بەم جۆرە كۆمەڵی هەقە كەوتە قۆناغێكی نوێوە بەرەو ژیانی هاوبەشی و سەربەستیی ئافرەت و باوەڕ بە ڕێبازی دیموكراسی لە بەڕێوەبردنی

---

= حەمە سوور) مەسەلەی كۆمەڵایەتی پتر بێتە ئاراوە، وەك نیشانەیدیاریی دابوو. لەوانە سەرەنجامی ئەوە بۆ ئەم لا باش نەبێ. سەرەڕای ئەوە كە دووبەرەكییەكە خۆی مەترسییەكی گەورەی بۆ سەرانسەری بزووتنەوەكە پێوە بوو و هاندەرێكی باش بوو بۆ بەرەی ناحەزان كە بە هەموویانەوە كوتەكێكی كوشندەی تێ سرەوێنن.
بۆیە پێویست بوو مامە ڕەزا بیرێكی ورد لە ڕێكخستنەوەی بزووتنەوەكە بكاتەوە و كارێك بكا بنەڕەتێكی ئایدیایی و كۆمەڵایەتی و ڕەفتاریی بۆ دانێ و شوورەیەكی لە ڕێكوپێكیی ناوخۆ بۆ دروست كا نەهێڵێ ناحەزان بتوانن دەستی تێ وەردەن.
هەر بۆیەش، وەك مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا ئەڵێ، زۆر لە بیروباوەڕەكانی دەستەی حەمە سووریشی هێنایە ناو كۆمەڵەكەی خۆیەوە، لام وایە ئەمەش بووبوو بەهۆی ئەوەی پاشان دەستەی حەمە سووریش و شێخ عەبدوڵایش، وەك پێشتر باس كرا، دان بە پێشەوایەتیی مامە ڕەزادا بنێن –م . م. ك

(٣) شێخ حوسەینی خانەقا لە بارەی ڕێكخستنەوەی كۆمەڵەی هەقە و دانانی ئەو خاڵانەوە، پاش باسكردنی ئەو پشێوییە ئایدیایی و ئاینییەی كە پاشان هەندێ نموونەی بە زمانی خۆیەوە لە پەڕاوێزی ژمارە(٢) لا پەڕە (٨٧)و (٨٨)دا دەگێڕینەوە– دەڵێ: (سەیر نییە لە حاڵەتی ئاژاوەی وادا گەلێ كەس بە تایبەتی لەوانەی كە خۆیان لە مەسەلەكەدا بە دەسەڵاتدار و (زادەگان) دەزانن، گەلێ كاری ناجۆر و ناشەرعییان لێ بووەشێتەوە و ئا لەم حاڵەدا بوو بیر لە دانانی (ڕەوشت) كرایەوە. كە بریتی بوو لە قاعیدەو نیزامێك بۆ بەربەستی خراپە و دەسدرێژ. حەمە سوور لە ریزی پێشەوەی ئەوانەوە بوو كە بیریان لەمە كردەوە. لەگەڵ یارمەتیدەرێكی كە ناوی حەسەن جۆیلاخی بوو، هاتنە لای من و سكالای ئەم مەسەلەیەی كرد و وتی نیازی شتێكم هەیە و منیش بە باشم زانی و گفتی یارمەتیم پێ دا. ئەمە بوو سەرچاوەی دانانی (ڕەوشت)و پاشان مامە ڕەزا بە یارمەتیی شێخ محەمەد ئەمینی مەڵحە، كە وەك دەستە ڕاستی بوو، مەسەلەكەیان قۆستەوە و بڵاویان كردەوەو بە ناوی ئەوانەوە دەرچوو. من لەم قۆناغەیشدا دەورێكم هەبوو لە تەنقیح كردنیدا» – م. م. ك .

کۆمەڵدا و، بەربەرەکانێکردنی زۆردارانی ناو کۆمەڵ و دژایەتی لەگەڵدا کردنی خوێنمژانی چینە هەژار و ڕەنجکێشەکان و بۆ ئەم مەبەستە گەلێ جار هەنگاوی هەڵهێناوەتەوە.

نموونەیەکی ئەم هەنگاوانە ئەوەیە لە کاتی تەسویەی حوقووقی زەویوزاردا هەندێ لە ئاغاکانی پشدەر و کۆیە ویستبوویان گوندی (گەڵنێری) کە دەکەوتە ناوچەی (میرزا ڕۆستەم)ی سەر بە ڕانیە، بۆ خۆیان داگیر بکەن. خەڵکی گوندەکە دەچنە لای مامە ڕەزا بۆ ئەوەی یارمەتییان بدا.

سەنەدێکی ڕەسمی لای دادنووس (الكاتب العدل) بۆ مامە ڕەزا دەکەنەوە کەوا زەویوزارەکانیان هیی ئەوە. مامە ڕەزایش، پشت بەو سەنەدە، ئاغاکان لە دەست بەسەرداگرتنی گوندەکە دوور دەخاتەوە و پاشانیش زەویوزارەکان بۆ خەڵکی گەڵنێری ڕەت دەکاتەوە.

## بەرنامەی مامە ڕەزا

## بۆ ڕێکخستنەوەی کۆمەڵەی (هەقە)

ئەو خاڵانەی مامە ڕەزا دای نان بۆ ڕێکخستنەوەی کۆمەڵەی هەقە تایبەتیەتیی ئەم کۆمەڵەیان لە جاران زەقتر پێ کەوتە بەرچو و وەك بەرنامەیەکی کۆمەڵایەتییان لێ هات بۆی و بەجێبەجێکردنیان لەناو خەڵکەکەدا گوڕێکی تازە کەوتە گیانی بزووتنەوەکە و بەمەش گەلێ لەجاران زیاتر کوورەی کینەی ناحەزانی لێ هاتە جۆش. ئێمە لێرەدا هەوڵ دەدەین بەکورتی لەو خاڵانە بدوێین و ڕوونیان بکەینەوە:

یەکەم - برایەتی:

مەبەست لە (برایەتی) ئەوە بوو هەموو هەقەکان برا و خوشکی یەکترین و هیچ جۆرە جیاوازییەك لەنێوانیاندا نییە و نابێ ببێ، چ بەهۆی دەوڵەمەندی و هەژاری و چ بەهۆی ڕەیشەی کۆمەڵایەتییەوە. بزووتنەوەی هەقە هەرچەند لە بنەڕەتدا لەناو هەژاران و چەوساواندا پەیدابوو، ژمارەیەکی زۆریشی لە کەسانی سەر بەچینەکانی تری کۆمەڵ لە خۆی کۆ کۆکردبوەوە و بێ جیاوازی خستنە نێوانیان هەموویانی لە یەك ڕیزدا ڕاگرتبوو و هەموو وەك برا ڕەفتاریان لەگەڵ یەکدا دەکرد.

لە ئاغاو دەسەڵاتدار و مەلا و حاجییانی ئەو سەردەمە کە بووبوون بە هەقە، کەسانی وەك کاکە حوسەینی خانەقا(١)، جەمیلی عەلی ئاغای دزەیی، مەلا سەلامی کەرکووك(٢) مەلا حامیدی مۆرد، مەلا ڕەشید ئۆمەر

(١) شێخ حوسەینی خانەقا کە لە پەڕاوێزەکانی ئەم کتێبەدا گەلێ قسەی بەزمانەوە گێڕاوەتەوە - م.م.ك.

(٢) ئەم مەلا سەلامە لە کاتی چاپی یەکەمی ئەم کتێبەدا مابوو و لە کەرکووك دەژیا. =

گومەتیی مەلای مزگەوتی عەسکەر و نەسرەدین کوڕی قەرەتی ئاغا لە گوندی کانی بیی دەشتی کۆیە[٣] مەحموود ئاغای پژدەر لە تیرەی میراودەلییان بەنموونە دەهێنینەوە[٤] ئەم زاتەی دوایی بە تایبەتی لە سەرەتادا زۆر بەتوندی بەربەرەکانێی مامە ڕەزای دەکرد، بەڵام پاشان بوو بە مریدی. ئەمانە نموونەی بەشداریکردنی چین و توێژەکانی کۆمەڵەی کوردەوارین لە بزووتنەوەی هەقەدا، هەرچەند هەندێکیشیان پاشان پاشگەز بوونەوە وەك لەناو هەر کۆمەڵە و تاقمێکدا ڕوودەدا.

دووهەم–هەقپەرستی:

کۆمەڵەی هەقە زۆر ڕوو لە هەقپەرستی بوون و لایەنی هەقیان دەگرت با قازانجی خۆیشیانی تێدا نەبوایە. زۆر جار ڕێ کەوتووە دوو کەس لە هەقەکان لەسەر شتێك ناخۆشییان کەوتووەتە نێوان، برای هەرکام لەم دووانە ئەگەر زانیبێتی براکەی خۆی لەسەر هەق نییە، لایەنی نەگرتووە لە دژی پیاوەکەی تر و بەپێچەوانەیشەوە وا ڕێك کەوتووە پشتگیریی کەسانێکیان کردووە لە دژی کەسی خۆیان کە هیچ پێوەندییەکیان لەگەڵیاندا نەبووە، هەر لەبەرئەوە کە لایان وابووە ئەو کەسانە لەکێشەکەیاندا لەگەڵ کەسەکانی ئەمان لەسەر هەقن و هەق بەلای ئەوانەوەیە.

---

= تەمەنی، وەك خۆی دەیوت لە دەوری٨٥ ساڵیدا بوو. لە سەردەمی بزووتنەوەی هەقەدا مەلای دێی (دارەوا) بووە. وەك خۆی، لە دیدارەکەیدا لەگەڵ شێخ ستار، دەڵێ لەسەر هەقەیەتی ٢٩ ڕۆژ گیراوە و ١٠ دینار جەزای لێ سەنراوە. هەر بە قسەکانیدا لەو دیدارە دیارە پیاوێکی وریا و زیرەك و زۆر دژی حەمەسووریش بووە. پاش کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریمیش دوای هیچ شێخێکی هەقە نەکەوتووە–م.م.ك.

(٣) ئەم زاتە پیاوێکی دڵسۆز و عاقڵ و تێگەیشتوو و بەخزمەت بوو بۆ حەقە، لە برا سەیارەکان و برا موخلیسەکان بوو.

(٤) تەماشای پاشبەندی یەکەمی ئەم کتێبە بکە کە مامۆستا هەمزە عەبدوڵا نووسیویەتی–م.م.ك.

**سێیەم- گیانی هاوبەشی:**

واتە پەرەپێدانی گیانی هاوبەشی لە سامان و داراییدا بە گشتی. بەپێی ئەم پێڕەوە هیچ کەسێکی هەقە خۆی لە ئاستی کۆمەڵەکەیدا بە خاوەن ماڵ و سامان و زەوی نەزانیوە و هەر ماڵێکی بووبێ وا دانراوە هیی هەموو کۆمەڵەکەیە نەك تەنیا هیی ئەو، بە واتەیەکی تر ئەو ماڵە بە ڕاسپاردە دانراوە لە ژێر دەستی خاوەنەکەیدا.

شێوەی ژیانی هاوبەشی و هەستی یەکیەتی و بێ تەماعیی ناو هەقەکان وای دەردەخست کە باوەڕیان بە جۆرە سۆشیالیزمێك بووبێ، چونکە کەسیان بێ پرسی ئەوانی تریان، یان بێ بەشداریکردنی کۆمەڵ دەسکاریی ماڵ و سامانی خۆی نەدەکرد. زۆرجار ڕێك کەوتووە جۆرە خواردنێك یان میوەیەك هەڵگیراوە تا بە کۆمەڵ بخورێ. زۆرجاریش ڕێك کەوتووە تاقە سێوێك یان خواردەمەنییەکی کەم یەك کەس بەتەنیا نەیخواردووە، بەڵکو بەپێی ژمارەی سەری ئەو کەسانەی لەو کاتەدا لەو شوێنەدا بوون – دابەش کراوە. ئەگەر یەکێکیش لە هەقەکان پێویستییەکی بووبێ و بە تەنیا خۆی بۆی جێبەجێ نەکرابێ، ئەوانی تر یارمەتییان داوە، جا چ بە پارە یا بەکار بۆ کردن.

**چوارەم- ئابوونە:**

بۆ بەهێزکردنی پەیوەندیی نێوان کۆمەڵەکەیان و پەیداکردنی سەرچاوەیەکی دارایی بۆ بەڕێوەبردنی خانەقا و تەکیەکانیان، دەبوو هەر هەقەیەك یا هەر خێزانێکی هەقە بەشێوەی ئابوونەیەکی مانگانە بەشداری بکا و ئەو ئابوونەیە دەدرایە دەستی سەرتەکیەی گوند یا برا سەیارەکان(٥) چی پێویست بوایە بۆ تەکیەی دێ، بۆی خەرج دەکرا و ئەوەیشی دەمایەوە ڕەوانەی خانەقای کەڵکەسماق دەکرا.

---

(٥) تەماشای باسی (بانگ ڕاهێڵەکانی هەقەیەتی) بکە- م.م.ك.

پێنجەم- تەگبیر و ڕا:

هەموو هەنگاوێك و قسەیەكی ژیانی هەقەكان بە پرس و ڕای یەكتر بوو. كۆ دەبوونەوە بۆ لێكۆڵینەوەی ئەو گیروگرفتانەی دەهاتنە ڕێیان تا دەگەیشتنە ئەنجامێك هەموویان پێی ڕازی بن. ئەم جۆرە ڕەفتارە دیموكراسییەیان ناونابوو (پرس و ڕای ناو برایەتی). لەم پرس و ڕایەدا هەموو كەسێك مافی بەشداربوونی هەبوو، چ پیاو چ ئافرەت بە بێ جیاوازی.

شەشەم- سەربەستیی ئافرەت:

هەقەكان باوەڕیان وابوو كە جیاوازی لە نێوان پیاو و ئافرەتدا نییە و هەموو خوشك و برای یەكن و(٦) هەموو ئافرەتێك وەك هەر پیاوێك،

(٦) مامۆستا كەریم زەند دەڵێ: «كۆڕی یادەوەرییان نهێنییە، كەسی تر بەشدار نابێ. ڕەبەنیش دەبێ دەستە خوشكی خۆی لەگەڵدا بێ» (بڕوانە: كەریم زەند، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٧).
لام وابێ مەبەستی مامۆستا كەریم زەند ئەوەبێ ڕەبەنیش لە كۆڕی شوغڵەدا بێ دەگونجێ ئافرەتێكی مرید (یا هەقە واتەنی: خوشكێك)ی لەگەڵدا بێ و هەركەسە لە لایەكەوە سەری خۆی كز كردبێ و خەریكی شوغڵەی خۆی بێ. بەكورتی هەقەكان بە چاوێكی ئەوەندە پاك و خاوێن دەیانڕوانیە پێوەندی پیاو و ئافرەت، ئەم بەدگومانی و داوێن پیسی و نیازی خراپەیان بەبیرا نەدەهات كە ئێستا لەگەڵ پێكەوەبوونی ئافرەت و پیاوی ناو كۆمەڵدا بەبیردا دێ.
(شێخ ستار لە داوێنی ئەم پەراوێزەی كاك مستەفا عەسكەرییەوە نووسیویە دەڵێ: «نەدەبوو بنووسی ئەم كتێبە لە مەسەلەی پێوەندییەكانی نێوان پیاو و ئافرەتدا ئەوەندە خۆش باوەڕ بێ لای وابێ لەوانەیە لە كۆمەڵگایەكی دواكەوتوودا پیاو و ژن كە پێكەوە گونیە لەبەر بكەن و بكەونە دەشت و چۆڵ و بیابان، داوێن پاكی لە نێوانیاندا هەر بمێنێ و هەروەك برا و خوشك سەیری یەك بكەن (پێشتر وتمان مەلا سەلامی ترێخۆر، لە دیدارەكەیدا لەگەڵ شێخ ستار خۆی، دەڵێ: ژنان لە ڕەوەكەدا بۆ كەركووك گونیەیان لەبەر نەكردبوو). كێ دەڵێ مەسەلەی پێوەندیی نێر و مێ لە =

خاوەن مافە لە بەشداریکردنی بەڕێوەبردنی کۆمەڵ و خێزان و لە پرس و ڕای ناو برایەتی و لە هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیاندا و بە هیچ جۆرێ زۆر لە ئافرەت نەدەکرا لە بەشوودانیدا.

لەناو هەقەکاندا (شیربایی) نەبوو. تەنیا مەرجێك کە بوو، قایلبوونی کوڕ و کچ بوو بە یەکتر. لەمە بەولاوە، وەك لە ناو هەموو موسوڵمانانندا، شیرینی دەخورایەوە و ژن مارە دەبڕا و بە بووکی دەبرا و دەگوێزرایەوە.

ئەم سەربەستییەی ئافرەت لەناو هەقەکاندا، کرابوو بە چەك بەدەست ناحەزانیانەوە، لە هەموو لایەکەوە واتەوات و پڕۆپاگەندەی ناشیرینیان لە

---

= نێوان دوو کەسی هەقەدا، بە مەفهوومی هەقە خۆیان، (داوێن پیسی)یە؟».
پاشان نموونەیەك دەگێرێتەوە دەڵێ: «من ئاگادارم، لە ڕێدار لە ناوچەی شوان ئافرەتی هەقەم دیوە دەیوت: پیاو و ژن شەو پێکەوە دەخەون کیوێکیان لە بەینایە. پاشان هەر ئەو ئافرەتە وتی: شەرت نییە ئەو کێوە کێوی ڕاستەقینە بێ، بەڵکو بەردێکی بچووك لە نێوان هەردووکیان دادەنێن و شەو هەموو پێوەندییەکەی نێر و مێیانەشیان دەبێ...تاد».
شێخ ستار دوایی بەسەراچوونەوەکەی بەوە دێنێ، دەڵێ: «هەر چۆن بێ، بەڕای من، ئەم مەسەلەیە دەبێ لەمەندە زیاتری لەسەر بنوسرێ».
منیش بە پێویستی دەزانم بڵێم بێ گومان ئێمە خۆمان لە پاکانە بۆ کردنی هەقەکاندا لە بارەی پێوەندیی نێر و مێوە، لەژێر تەئسیری بیروباوەڕی دەوروبەری خۆماناین و دەمانەوێ بەو سەنگ و ترازووە بێ گوناهیان دەرکەین، بەڵام ئەو سەنگ و ترازووە خۆی سەنگ و ترازوویەك نییە بە هیچ جۆرێ ڕەخنەی لێ نەگیرێ و لە هەموو بارودۆخێکدا بۆ ئەوە بشێ بکرێ بە سەنگ و ترازو. ئاشکرایە بزووتنەوەی هەقە ئەندازەیەکی ئەوتۆ ئازادیی بۆ ئافرەتان و بۆ دروستکردنی پێوەندیی هاوسانی ژن و پیاو ڕەخساندبوو کە کۆمەڵگای دەوروپشت خەویشی پێوە نەدەبینی. بەڵام لەڕاستیدا ئەو ئازادییە نەئەوەندە بوو کە کۆنەپەرستەکانی ناو موسوڵمانانی تر هەقەیان پێ تاوانبار دەکرد و نەبەهۆی هەندێ بارودۆخی دەسەڵات بەسەرەوە نەبوویشەوە دەکرا ئەوەندە بێ– م.م.ك.

دژ بڵاو دەکردنەوە کە گوایە هەقەکان ئیباحین و ئافرەتیان هێی هەموویانە و (تەگە و بەرانی ئەنیشنە یەك)(٧). لە ڕاستیدا ئەم قسانە سەرانسەری ناڕەوا و دوور لە ڕاستی بوو، چونکە ئەو سەربەستییەی ئافرەتانی هەقە هەیانبوو، لە کورۆکدا هەر ئەو سەربەستییە بوو کە ئاینی ئیسلام دانی تێدا ناوە بۆ هەموو ئافرەتانی موسوڵمان، بەڵام چونکە ساڵانی ساڵ بوو لە کۆمەڵگەی ئیسلامدا پشت گوێ خرابوو، لە بیر چووبوەوە و هێنانەوە ئارای لەگەڵ سوودی کۆنەپەرستان و میری و ئەوانە ڕێك نەدەکەوت کەوا بازرگانییان بە ئافرەتەوە دەکرد.

بەڕێز مامۆستا محەمەد سەعید فەقێ مەحموود لە لاپەڕە (٤٧)ی کتێبەکەیدا بەناوونیشانی (یادداشتەکانم لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیدا و تیشکێك بۆ سەر ژیانم لە بەڕێوەبەرایەتیدا) کە وەرگێڕدراوەتە سەر عەرەبی و (دار الحکمة، لە لەندەن لە ٢٠٠٤ دا لە چاپی داوە)، دەڵێ: «کەسانێك لە ناوچەکەدا هەبوون پێیان دەگوتن (هەقە) لە سێ گوندی ئەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون. ژمارەیان لە ٥٠٠ کەس تێ نەدەپەڕی. لەناو خەڵکەکەدا وا باو بوو ئەم کۆمەڵە هەقەیە بەپێچەوانەی شەرعەوە کاردەکەن و نیشی بێ شەرعی دەکەن. سەرۆکەکەیان ناوی مامە ڕەزای حاجی شێخ مستەفا بوو، حکوومەت خستبوویە ژێر چاودێرییەوە. ئەو سەردەمەی بەڕێوەبەری ناوچەی (میرزا ڕۆستەم) بووم، بەدزییەوە چووم بۆ (کەڵکە سماق)، سەر لەبەیانی، نیوەڕۆ، پێش خۆرئاوا، بۆ ئەوەی تێ بگەم چی دەکەن. هیچ کارێك و کردارێکی پێچەوانەی شەرعم نەدی. تەنیا ئەوەندە ئەم کۆمەڵە خەریکی زیکری خوا بوون و دەیانگوت (خودا هەقە، کەس نییە لە هەق بەولاوە).

---

(٧) مەلا سەلامی ترێ خۆر، لە دیدارەکەیدا لەگەڵ شێخ ستار، زۆر بەتوندی بەرپەرچی بوختانی ئیباحییەتی و مەشاعییەتیی هەقەکان دەداتەوە- کە ئەمەش قسەی ژنە هەقە ڕێدارییەکە هەڵدەوەشێنێتەوە کە پێشتر شێخ ستار بە دەمیەوە گێرایەوە- م.م.ك.

کە پرسیارم لە بارەی بیروباوەڕی ئەمانەوە کرد، کەس هیچی بۆ ئاشکرا نەکردم جگە لەو وشانە. نهێنیی خۆیان لە هەموو شتێکدا دەپاراست. هەروەها دەیانگوت خودا ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە لەسەر هەقن. لە پاشان سەرۆکەکەیان تووشی شەپلە بوو و نەیدەتوانی بگەڕێ یان لە گوندەکە دەربچێ. زۆربەی مامە ڕەزاییەکان و ئەوانەی بڕوایان بە مەزهەبی هەقە هەیە لە گوندی (سەرگەڵوو)ی ناوچەی (سووورداش) نیشتەجێ بوون».

ئەوەی لەم دەقەدا هاتووە، جگە لەوەی دەری دەخا کەوا حکوومەت چاودێریی هەڵسوکەوتی هەقەکانی کردووە کە بەڕێوەبەری ناوچە خۆی ئەم کارە ئەنجام بدا، بەڵگەشە بۆ بەدرۆخستنەوەی هەموو ئەو پڕۆپاگاند و قسەو قسەڵۆکانەی دژ بەهەقەکان بەناهەق بڵاو دەکرانەوە.

مامۆستا جەمال بابانیش کە ماوەیەك بەڕێوەبەری ناوچەی (میرزا ڕۆستەم) بووە، لە میانی باسی ناوەڕۆکی کتێبی (ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە)دا، لە ژمارە ٢٣٣٤ی ڕۆژنامەی (العراق)دا کە لە ٥/١٠/١٩٨٣دا دەرچووە، نووسیویە دەڵێ:

«ئەو ماوەیە کە لە و ناوچەیەدا بووم جارێك نەمبیست شەڕ یا هەرایەك لەناو (هەقە)کاندا ڕوویدات یا خەرمانێك یا خانوویەك بسووتێ یا دزیی ماڵ و ئاژەڵ بکرێت، یاخۆ ژن هەڵبگیرێت کە ئەوانە لە دێهاتەکانی تردا ئەو ڕۆژە ڕەمەکی بوون، زوو زوو دووپات دەبوونەوە. تاکو ڕۆژێك نەمدی یەکێك لە دانیشتوانی دێهاتی (هەقە)کان بێ لە پۆلیسخانە، لای مودیری ناوچە سکاڵا لە یەکتر بکەن یاخۆ یەکێك سکاڵایان لێ بکات. هەر بەقەستی چاوەڕوانیی شتێکی وام دەکرد، ئێستاش نەمدی.

هەروەها مامۆستا جەمال بابان لە لاپەڕە ١٧٩-١٨٥ی (یادداشتنامەی ژیانم)، چاپی سلێمانی، چاپخانەی (ڕوون)، ساڵی

٢٠٠٧دا نووسیویە دەڵێ: «ئەو ساڵ و چەند مانگەی لەو ناوەدا بووم لە هەقە دێیەکان ڕۆژێك تاوانێك ڕووی نەدا، نەهاتنە پۆلیسخانە سکاڵایەك بکەن یا یەکێك سکاڵایان لێ بکا. دەستدرێژییان نەدەکردە سەر موڵك و ماڵی کەس، بەپێچەوانەوە کۆمەڵێکی بەڕێز و سەلار و خاوەنی کردەوەی جوان بوون. لە میانەی لێکۆڵینەوەمدا لە گەڵیاندا لێم دەبیستن دەیانگوت بەرانبەر بە ئافرەتی بێگانە (واتە جگە لە ژنی خۆیان) هەرگیز پیاوەتییان نامێنێ، واتە بەنەخوێنی حەرام ناکەنەوە. بۆیە دەبێ ئەو بیروڕا ناشیرین و ناهەموارانە دوور بخرێنەوە کە هەندێك قسەی نابەجێ و ناحەق، بەتایبەتی لە ڕووی ڕەوشتەوە دەدەنە پاڵیان».

تێکڕا ئافرەت خۆی لە کوردەواریدا جۆرە سەربەستییەکی هەیە، بەتایبەتی لە لادێدا عەبا و پەچە ناپۆشێ. لە کاروباری خێزان و بەڵکو لە دەغڵ و دان کردن و باخەوانی و ئاژەڵدارییدا بەشدارە. دەچێ بۆ شار بۆ کڕین و فرۆتن و پێشوازی لە میوان دەکا. لە بەشوودانیشدا کەمتر زۆری لێ دەکرێ و بەزۆر دەدرێ بەشوو، بەڵکو تەنانەت گەلێ جاریش وەك جەنگاوەر چەك هەڵدەگرێ و داکۆکی لە هۆز و خێڵ و نیشتمانەکەی دەکا. خۆ ئەگەر سەیری وڵاتانی پێشکەوتوویش بکەین، بۆمان دەردەکەوێ سەربەستیی ئافرەت لەو وڵاتانەدا گەیشتووەتە چ ڕادەیەك، ئیتر بۆ دەبێ ئەو سەربەستییەی هەقە بە ئافرەتیان دابوو، وا بکرێ بە هەرا و پڕوپاگەندەی لە دژ بکرێ[8] بەڵام ڕاستەکەی ئەوەیە هەقە لەناو کۆمەڵێکی

(٨) بۆ نموونە دەیانوت هەقەکانی هەر شوێنێ، بە پیاو و ژنیانەوە، هەموو لە یەك حەوزا مەلە دەکەن، بێ ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە کە ئەگەر مەبەستیان لە مەلەکردنە بۆ لەشپیسی، ئەوە دەبێ هەقە مەلە بۆ لەشپیسی بۆ بکەن مادام حەلاڵ و حەرامیان لا نییە، وەك ئەمانە خۆیان دەڵێن و مەلەیش یەکێکە لە داونەریتەکانی ئاینی ئیسلام! خۆ ئەگەر مەبەستیشیان لەوەیە هەموو بەجارێ مەلە دەکەن، ئیتر بە هەر مەبەستێ بێ، ئەوە دەبێ کام حەوز بووبێ لە کوێرە دێکانی هەقەکاندا، خەڵکی ئاوایی هەموو بەپیاو و ژنیانەوە مەلەیان تێدا کردبێ؟

دواکەوتوودا دانیان بە سەربەستیی ئافرەتدا نابوو کە خەڵکی ئەوەیان بە ئاسانی بۆ قووت نەدەچوو، بۆیە ئەو هەموو درۆ و دەلەسەیان بەزمانەوە کرا و، ئەو هەموو بوختان و قسەی نابەجێیەیان بەدەمەوە هەڵبەستن(٩)

---

(٩) تەنانەت خوێندەوارێکی ئەورووپاییی وەك ئێدمۆندزیش گەلێ لەم درۆ و دەلەسە و بوختانانەی ناحەزانی هەقەکانی لە کتێبەکەیدا نووسیوەتەوە، هەرچەند ناشیەوێ خۆی بەتەواوی بکا بەخاوەنی قسەکانی (بڕوانە: سی. جی. ادموندز، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٧-١٨٨).

لە بارەی بوختان و درۆ و دەلەسەکانی ئەدمۆندزەوە لە دژی هەقەکان، خوا لێخۆشبوو مامۆستا ڕەئوف محەمەد زوهدی لە لاپەڕە (٨٢)ی کتێبەکەیدا (بۆ لە هەقە کەوتنە تەقە؟)دا دەڵێ: لێرەدا پرسیارێك قوت دەبێتەوە و دێتە پێشەوە: بۆچی مستەر ئەدمۆندز ئەوەندە بێ لوتفە لەگەڵ هەقەکاندا؟ ئایا هیچ شێوازێکی دەملووسی و دیبلۆماسیی ئەوتۆی نەبوو لە ئەرکی ئەم گرتن و بردنە، چ لەسەر شێخانی (هەقە) و چ لەسەر میریش کەم کاتەوە، لە کاتێکدا کە ئەم فەرمانڕەوایەکی بەرز و گەورە بوو لە داودەزگای وەزارەتی ناوخۆکەی ئەو میرییەدا. وە یا کارێکی وەهای بکردایە، هیچ نەبێت، لە هەندێ (شێخە)کانیان بکات بەئەنگوستیلە و بیانکاتە پەنجەی خۆیەوە؟ من بەش بەحاڵی خۆم لەو باوەڕەدام کە ئەدمۆندز لەم ڕوومەوە هەرگیز کەمتەرخەم نەبووە و درێخیی نەکردووە؟ چوونەکەی بۆ (شەدەڵە) بۆ خزمەت شێخ عەبدولکەریم نیشانەیەکی زەقی چالاکی و لێهاتوویی بووە بۆ بەرژەوەندی فەرمانڕەوایەتییەکەی. بەڵام وا دیارە کە خوا لێخۆشبوو شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەی بۆنەرم نەکراوە و نەخووساوە. مایەی شانازییە بۆ خوا لێخۆشبوو شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە کە مستەر ئەدمۆندز نەیتوانیوە هەڵی فریوێنێ و لاسی بدات. بێگومان ئەم پێشنیازی هەبووە، بەڵام شێخ قوبووڵی نەکردووە و دەستی ناوە بەڕوویەوە، بۆیە بەو جۆرە لە (هەقە) و لە شێخانی سەر بەهەقە بەقینەدا چووە. ئەوەی پێی وتوون، پێی وتوون (ل١٨٧ کتێبەکەی ئەدمۆندز: کرد، ترك، عرب). ئینجا ئەو کۆڕ و کۆمەڵانەی کە بەهەزار و یەك پەت پابەندی ئەم و جڵەوی کاریان بەدەستی ئەمەوە بوو بەڕووپامایی دەهاتن قسەکانی ئەمیان دەقۆستەوە بەهەقەکانیان دەوتەوە، تەنانەت بۆئافەرین لە =

لەم بارەوە مامۆستا ڕەئووف محەمەد زوهدی دەڵێ: «ئیتر ئەو ژیانە کۆمەڵایەتییەیان کەوا (هاویەشی و تەبایی)یەکەیان بناخە ئابوورییەکەی بوو... وە لە نیش و فرمان و بەرهەمهێنانیشدا هەرەوەزییەکی سادە و ساکار دەوری تێدا دەبینی، وە لە بەکارهێنان و سوود لێ وەرگرتنی بەرهەمیشدا جۆرێك لە ڕەوشتی گشتیی بەرەیەك خۆی تێدا دەنواند... هتد. بۆیە لەچاو کۆمەڵگە فراوانەکەدا تۆزێك ڕەوشت و کردەوەیان جیاواز بوو. ئەو ڕەوشتە گشتییەیان بەرژەوەندی هەموو ئەندامێکیانی بەنێر و مێوە لە مەسەلە کۆمەڵایەتییەکەیاندا تواندبووەوە.. وە لە ڕووی سایکۆلۆجییەتی سایکۆلۆجیاشەوە گەلێك کاری تێ کردبوون هەڵپەی نێر و مێیانی سارد کردبووەوە چونکە خۆیان بەئەندامی یەك خێزان دەزانی کەوا (نان و نمەك لە بەیندایە). بڕوانە: ڕەئووف محەمەد زوهدی، بۆ لە هەقە کەوتنە تەقە؟ بەغدا، چاپخانەی (الحوادث)، ساڵی ١٩٨٥ ، لاپەڕە (٢٦).

لە لاپەرە (٣٤)ی هەمان سەرچاوەدا خوا لێخۆشبوو مامۆستا ڕەئووف محەمەد زوهدی دەڵێ: «بێگومان ئەو بەرەڵاییەی کە دەدرایە پاڵ (هەقە)کان لە بابەت تەگە و بەرانییەوە لەوەوەیە کە ئافرەتی (هەقە)کان

= لە لایەن ئەمەوە و ڕەزامەندی (سڵاو)یشیان دەدایەوە... هتد.

هەر لە میانی ئەم باسانەدا مامۆستا عارف تەیفوور لە ژمارە (٦٩)ی ساڵی ٢٠٠٢ی کۆواری (ڕامان)دا لە ژێر ناوونیشانی «تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ ئەحمەدی سەرداری سەرگەڵووییەوە بەرەو هەقە»دا دەڵێ: «.. بەڵام کەسانێکی نەفس نزم زۆر شتی بێ ویژدانییان بەرانبەر شێخ عەبدولکەریم و موریدەکانی گوتووە کە زۆر لە ڕاستی و حەقیقەتەوە دوورە، بەتایبەتی کە باسی پێوەندیی ژن و پیاو دەکەن. ئەمە هەرچی ڕاستی هەیە تێیدا نییە و شتێکی زۆر دوورە لە شێخ عەبدولکەریمەوە، چونکە وەك باسی دەکەن مرۆڤێکی وا بەتەقوا و خواناس ناکرێ ئەو جۆرە شتانە لە موریدەکانی قبووڵ بکات».

سەربەستتر بوون لە ئافرەتی کۆمەڵگە فراوانەکەی تێیدا دەژیان. سنووری کۆمەڵایەتیی ئەمان لە هیی ئەوان تۆزێك پان و بەرینتر بوو. هەندێ باج کە لە کۆمەڵگە فراوانەکەدا بەسەر ئافرەتەوە هەبوو لە چارەنووس و شووکردنیدا، (هەقە)کان نەیاندەسەلماند و دانیان پێدا نەدەنا. هەندێ لایەنی تریش کە دەبوو بەئاشکرا بەرهەڵستی ئەو باجانەیان بکردایە، با لە بەهێزترین باوەڕیشدا نەبێ بەڵکو لە لاوازترین بڕوادا (أضعف الایمان) بوایە، باری هیچ نەبێ نەیانسەلماندایە. کەچی چاویان لێ دەپۆشی و لێی بێدەنگ دەبوون کە بێدەنگی نیشانەی ڕەزامەندییە، دوور نییە بەجۆرێکی تر پشکێکی خۆیانی تێدا نەبێت. ئەم باجانەش وەکو شیربایی و سوورانە. دیارە نەسەلماندنی ئەم دوو نەریتە لەمەڕ کۆمەڵگە فراوانەکە لە لایەن (هەقە)کانەوە، سەرەڕای ئەوەی کە یاخیبوون و سەرپێچییە لەو دوو نەریتە، هەرەشەیەکیشە لە بەشێك لەو کۆمەڵە بیروباوەڕەی کە کۆمەڵگەکەی سەرومڕ پێ گۆش کراوە و بڕوای پێیەتی. جگە لەوە زیانێکیش دەگەیەنێت بەگیرفانی ئەوانەی سوودمەندن لەم دوو نەریتە کە ڕاستەوخۆ دەرەبەگەکانن».

هەر لە بارەی ئافرەتەوە مامۆستای خوا لێخۆشبوو دەڵێ: «لە بابەت ئافرەتەوە (هەقە)کان هیچ نەریت و پێڕەوێکی ئەوتۆیان نەبووە کە تایبەتی بێت بەخۆیان و لە کۆمەڵگەکەی تێیدا دەژین جیایان بکاتەوە. بێ پرسی (مەلا) و بێ ئاگەداریی ئەو هیچ پیاوێك نەبووە بەمێردی هیچ ژنێك. خۆ ئەگەر حاڵەتێك ڕووی دابێت، ڕەوشتێکی گشتیی ئاراستەکراو نەبووە لە ناویاندا کەوا لە مەرکەزیەتیکەوە هاتبێت، بەڵکو بریتی بووە لە پیلان و دەسیسە بۆ ناو زڕاندن و بەدناوکردن. لەم ڕووەوە (هەقە)کان زۆر داوێنپاکترن لەو کوڕ و کۆمەڵە تێرخۆر و تێرشۆرەی کە لە هیچیان کەم نییە». هتد.

(هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٣٩).

«لە ناو هەقەکاندا کەم کەس هەبووە دوو ژن یا سێ ژنی هەبووبێت. تەنانەت خوا لێخۆشبوو شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە لە ژیانیدا تەنیا ژنێکی هەبووە. بۆیە ناوی ئەم زاتەم هێنا چونکە پیری گەورەیان بووە». (هەمان سەرچاوە، لاپەڕە٤٠). «لە ڕێڕەوی ئەم باسەدا گەلێك پرسیار دێتە پێشەوە، گرینگەکەیان: بۆچی ئەم قسە و بوختانانە بۆ (هەقە)کان بەگشتی دەکرا؟ کەچی مورید و مەنسووب و مەحسوویی ڕێبازە کلاسیکییەکانی تر (پیاوچاك) بن و لە خەڵکی ببنە پەپوولە و فریشتە، لە کاتێکدا (شێخ و پیر)ی (هەقە)کان و سەرکردەکانیان بەسەنگ و تەرازووی ئاین و ڕەوشت و کردەوە، ئەگەر لە شێخ و سەرکردەی ڕێبازەکانی تر قورستر نەبووبن سووکتر نەبوون؟ بێگومان ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەموو تەنگوچەڵەمە کۆمەلایەتییە کە کۆمەڵگەی خستبووە سەغڵەتییەوە. (هەقە)کانیش هاتن چارەسەری ئەو تەنگوچەڵەمانەیان - گەرچی بەجۆرێکی ساکاریش بێت - ئاوێتەی سۆفیگەرییەکەی خۆیان کردبوو، کەوا ڕێبازەکانی تری مونافیسیان کەم و زۆر خۆیان لە قەرەی نەدەدا و توخنی نەدەکەوتن».

(هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٤٢).

حەوتەم - ڕەوشت:

ڕەوشت بریتی بووە لە کۆمەڵە ئامۆژگارییەك دەبوو هەموو بێ جیاوازی پێڕەویی لێ بکەن و هەر کەسێ پێڕەویی لێ نەکردایە یان بەپێچەوانەیەوە بجوولایەتەوە پێیان دەوت (بێ ڕەوشت) و بەگوێرەی جۆری بێ ڕەوشتییەکەی دەبوو هەندێ پارە بدا یا بۆ ماوەیەك (تەجمید) بکرێ یا ئەرکێکی بەسەردا بدرێ.

لەم دێرانەی خوارەوەدا چەند نموونەیەك لەم ڕەوشتانە دەخەینە بەرچاو:

ا- دەست و زمان پاکی و دوورکەوتنەوە لە دزی و درۆزنی و بوختان و دووزمانی. هەموو ئەندامێکی تازە پاش ئەوەی تیٚ دەگەیەنرا دەبیٚ دوور بیٚ لەو کردەوانە، دەخرایە ژێر چاودێری و تاقیکردنەوە بۆ ماوەیەك. جا ئەگەر شتێکی لیٚ دەربکەوتایە، دوور دەخرایەوە و بەئەندام وەرنەدەگیرا. هەقەکان لە مامەڵە و ئیش و کاریشدا نموونەی ڕاستی بوون. درۆیان نەدەکرد و لە چاووڕاو و تەماعکاری دوور بوون.

ب- پاکوخاوێنی و پاراستنی لەشساغی. هەقەکان بایەخێکی زۆریان بەپاك و خاوێنی دەدا و هەمیشە لەش و جلوبەرگیان خاوێن ڕادەگرت. گۆرەوی خوریی هەتا ئەژنۆیان لە پیٚ هەڵدەکێشا و نافرەتیش بایەخێکی زۆریان بەپاك و تەمیزیی جلوبەرگ و ناوماڵیان دەدا و جلی جوانیان لەبەر دەکرد. خۆراك و قاپ و قاچاغی چێشت لێنان و کەلوپەلی چای خواردنەوەشیان زۆر بەپاکی ڕادەگرت.

جـ- پێڕەویی فەرمانی ناو کۆمەڵ و دەرنەچوون لە (ڕێزی برایەتی) وەك خۆیان دەیانوت(١٠).

---

(١٠) لێرەدا بەگونجاوی دەزانم لە بارەی بایەخی ڕێکوپێکی و یەکێتی و تێکنەدانی ڕیزەوە لای هەقەکان، ئەو قسەی حەمەسوورە بگێڕمەوە کە مەلا سەلامی ترێخۆر، لە دیدارەکەیدا لەگەڵ شێخ ستار، بەزمانیەوە دەیگێڕێتەوە و داوا لە شێخ حوسەینی خانەقا و شێخ عەبدولخالقی کوڕی شێخ عەبدولکەریم دەکا هەست بەلێپرسراوەییی خۆیان بکەن و کارێك بکەن مەلا سەلام بگێڕنەوە بۆ ناو ڕیزی هەقەکان. حەمەسوور دەڵیٚ: «کاکە حوسێن! تۆ کوڕی سەید ئەحمەدی، ئەوە (مەبەستی لە شێخ عەبدولخالقی کوڕی شێخ عەبدولکەریمە کە لە مەجلیسەکەدا بووە) کوڕی شێخە و ئێوە مەسئولیەتێکتان لەسەرە. ڕۆژی خۆی من لەگەڵ ئێوەدا موحاکەمەم هەیە. پرسییان چییە؟ فەرموو! وتی: ئەم مەلا سەلامە وەختی خۆی لەم دائیرەیەی ئێمە بووە، ئێستا وازی هێناوە و ئەم دائیرەیەش وەك تەزبێح وایە کە پسایەوە و قلێکی لیٚ ڕۆیی، هەموو دەپسێتەوە و خراپە، دەبیٚ ئێوە پێی بڵێن و تێی بگەیەنن بێتەوە ناو ڕیزی تەزبێحەکە، بێتەوە ناو خۆمان... تاد». م.م.ك.

د- شێوەی کـاسبـی و ئـیش و کـاریـان زۆر ڕێکـوپـێك بـوو، دوور لـە تەماعکاری و چەوساندنەوەی خەڵکی.

هـ- دوورکەوتنەوە لە کەسانی گومانلێکراو چ لە ڕووی ئاینەوە و چ لە ڕووی دنیاوە. بەم هۆیەوە کەمتر تێکەڵاوی کەسانی غەیری هەقە دەبوون و خۆیان لە هاوڕێیەتیی خەڵکی تر دەپاراست و لەم ڕووەوە ژیانێکی دەرگە داخراویان هەبوو(١١).

(١١) شێخ حوسەینی خانەقا دەڵێ: «هەقەکان حەزیان لە خوێندن نەبوو». منیش دەڵێم: لام وابێ ئەم حەز لە خوێندن نەکردنەیان لەبەر ئەو دوورەپەرێزی و خۆ تێکەڵی خەڵك نەکردنەیان بووبێ، چونکە خوێندن ناچاری دەکردن قوتابخانە لە دێهاتەکانیاندا بکەنەوە و مامۆستای حکوومەتی یا مەلای دێهاتی تر بێنن و ترسی ئەوەشیان بووە ئەو مامۆستا و مەلایانە شتی وا بەمناڵەکانیان بڵێن لەگەڵ ڕێبازی هەقەیەتی ڕێك نەکەوێ- م.م.ك.

منیش، مستەفا عەسکەری، دەڵێم:

لە لایەکەوە ئەمەی مامۆستا موحەممەدی مەلا کەریم نووسیویە ڕاستە و لە لایەکی تریشەوە حەقەکان حەزیان لە خوێندن بووە و منداڵەکانیان دەنارده قوتابخانە. بەڵگەیش بۆ ئەمە یەکێك لە کوڕەکانی مامە ڕەزای (ڕابەری هەقە) کۆلێجی مافی لە بەغدا تەواو کردووە و منیش لە پێش ئەودا، دەرچووی هەمان کۆلێجم. دوکتۆر عەلی عەبدوڕەحمان عەسکەریش کە ئامۆزامە کۆلێجی کشتوکاڵی لە بەغدا تەواو کردووە و بڕوانامەی دوکتۆرای لە یەکێك لە زانکۆکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وەرگرتووە. ئێمە کوڕانی شێخەکانی هەقەین. ژمارەیەکی زۆریش لە ڕۆڵەی هەقەکان چوونەتە قوتابخانە و بڕوانامەی بەرزیان وەرگرتووە، بەڵام هۆی ئەوەی خوێندن لەو سەردەمەدا باو نەبووە ئەوەیە کە دێهاتەکان دوور بوون و گوێ نەدراوەتە خوێندن و کردنەوەی قوتابخانە لە لادێکاندا.

لە لایەکی تریشەوە کاتێك مامە ڕەزا دوور خرایەوە بۆ عەمارە، لە ئەنجامی گفتوگۆدا لـەگەڵ حـکـوومـەت ڕێك کـەوتـن، هـەروەك لـە دوایـیـدا بـاسی دەکەین، کردنەوەی قوتابخانە لە ناوچەکەدا یەکێك بووە لەو خاڵانەی بڕیاریان لەسەر درابوو. ئینجا =

و- لە کاتی چاو بەیەککەوتن و چاك و خۆشی لەگەڵ یەك کردندا دەستیان دەخستە ناو دەستی یەکتر و[12] دەیانوت: «یا کەریم و یا ڕەزا» و مەبەستیان ناوی خوا بوو[13].

ئەمە جۆرە تەوقەیەك بوو پیاو و ژن و گەورە و بچووك دەیانکرد، ئیتر دەست ماچکردنیان لەناوا نەبوو. بەڕیز لای ڕاستەوە بۆ لای چەپ دەستیان دەکرد بەتەوقەکردن بێ ئەوەی کەس ببوێردێ و هەموو هەڵدەسانە سەرپێ. بەتایبەتی لە ناو هەموو ڕەوشتەکاندا، بەمجۆرە تەوقەیەش دەوترا (ڕەوشت).

---

= ئایا دەگونجێ حەقەکان حەزیان لە خوێندن نەبووبێ و بەندێکی لەو جۆرە لە ڕێککەوتننامەکەدا بچەسپێنن؟ بەڵگەیەکی تر: کاتێك جەعفەر عەسکەری لە هاوینی ساڵی ١٩٣١دا دەچێ بۆ سەردانی گوندی عەسکەر، لە کاکە ڕەزای کاکە عەلی دەپرسێ: چیتان پێویستە یارمەتیتان بدەم؟ کاکە ڕەزایش لە وەڵامدا دەڵێ: هیچ پێویستیمان نییە، تەنیا داوای کردنەوەی قوتابخانە دەکەین بۆ ئەوەی منداڵەکانمان بخوێنن. ئەم داواکارییە کە لە کاتێکدا بووە بزووتنەوەی حەقە لە سەرەتا و گەرموگوڕیدا بووە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی حەقەکان حەزیان لە خوێندن بووە. لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئاماژە بەنووسینێکی مامۆستا ڕەئووف موحەممەد زوهدییش بکەم کە لە لاپەڕە (١٦)ی کتێبەکەی (بۆ لە حەقە کەوتنە تەقە)دا دەڵێ: «لە ڕاستیدا گەلێك لە کوڕە شێخانی سەر بەحەقە لەگەڵ خۆمدا قوتابی بوون وەکو شێخ عەبدورەحمان کوڕی شێخ عەبدولکەریم و خوا لێخۆشبوو شێخ مستەفا کوڕی مامە ڕەزا.. هتد.

(١٢) لەم تەوقەیەدا دەستگوشین نەبوو، تەنیا سەری پەنجەیان دەگەیشتە یەك و لەوە بەولاوە دەستیان نەدەچووە ناو دەستی یەکەوە.

(١٣) من وای بۆ دەچم لە ڕاستیدا مەبەست لە (کەریم) و (ڕەزا) شێخ عەبدولکەریم و مامە ڕەزا بووبێ، بەتایبەتی کەوا دیارە ئەم دروشمە لە سەردەمی مامە ڕەزادا هاتووە نەك لە سەردەمی شێخ عەبدولکەریمدا کە هێشتا نەدەزانرا پاش ئەو کێ ئاڵای شێخیەتی هەڵدەگرێ. هەرچۆن بێ، ئەو کەسەی ئەم دروشمەی خستووەتە سەر زاری خەڵك، ئەوەندە زیرەك بووە بتوانێ بڵێ مەبەستم لە (کەریم) ناوی خوا و لە (ڕەزا)یش ئیمام عەلی ڕەزای کوڕی ئیمام مووسای کازمە- م.م.ك.

هەشتەم- کاروباری ڕێکخستن:

هەر گوندێ چەند هەقەیەکی تێدا بوایە، ئەو چەند هەقە خانوویەکیان لەو گوندەدا دەکرد بە (تەکیە)[14]. هەموو برا و خوشکانی هەقەی گوندەکە لە کاتی دەستبەتاڵیدا یا کاتێ کە میوانیان بهاتایە، یا کە پێویستییان بەپرس و ڕای ناو برایەتی و هەواڵ زانینی یەکتر بوایە، پێیان ڕادەگەیەنرا لەوێ کۆ ببنەوە و هەر پێشنیهادێك بوایە پێشکێش دەکرا و تەگبیر و ڕای ناو برایەتی دەکرا و لە مەسەلەکە دەدوان و دەکۆڵینەوە.

لەم تەکیانەدا ژیانێکی خۆش بەسەر دەبرا، بەتایبەتی لە کاتی دەستبەتاڵیدا بەتەبایی و خۆشیی یەکترەوە بەگۆرانی وتن و ڕاز و سەرگوزەشتە گێڕانەوەوە قسەی نەستەق و ئامۆژگاری و باسی ئاین و خواپەرستی و هەقپەرستی دەکرا.

ئەم تەکیانە هەمیشە نموونەی پاك و تەمیزی بوون. پێڵاو بردنە ژوورەوە یان هەروەها پێڵاو بردنە ناو ژووری دانیشتن و نووستن لای هەقەکان قەدەغە بوو. لە هەر گوندێکدا یەکێ لە هەقەکانی ئەو گوندە دەکرا بەلێپرسراوی تەکیە و پێیان دەوت (سەرتەکیە). ئەرکی سەرشانی ئەوە بوو تەکیەکە بەڕێوە بەرێ و ئابوونەی مانگانە لە هەقەکانی گوندەکە وەربگرێ و چی بۆ تەکیە پێویست بێ بیکا و خزمەتی میوانەکانی تەکیە بکا و، هەر فەرمانێ هەبێ پێیان ڕابگەیەنێ و هەر ئیش و کارێ هەبێ بیخاتە بەرچاو.

---

(14) مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا دەڵێ: «هەقەکان خۆیان بەم مەڵبەندانەی خۆیانیان دەوت (پۆلیسخانە)». دەبێ مەبەست لەم ناونانە ئەوە بووبێ وەك چۆن پۆلیسخانە لە دێهاتەکاندا مەڵبەندی فەرمانڕەوایی و بڕیاردانە، مەڵبەندەکانی ئەوانیش، لە هەر شوێنێ بووبن، مەڵبەندی فەرمانڕەوایی و بڕیاردان بوون بۆ ئەوان.
ئەمەش واتایەکی قووڵتر بەجۆری ڕێکوپێکیی ناو هەقەکان دەدا- م.م.ك.

وەك باسمان كرد لەو شار و گوندانەدا كە هەقەیان تێدا نیشتەجێ بوون تەكیە دەكرایەوە. ژمارەی ئەو شار و گوندانە لە (٦٢) شوێن زیاتر بوون. لە هەندێ شوێنی تریش هەقە هەبوون، بەڵام لەبەر كەمیی ژمارەیان لەو شوێنانەدا تەكیە دانەنرا بوو.

وا لێرەدا ناوی چەند شوێنێك لەو شوێنانە و ناوی سەر تەكیەكانیان، وەك نموونە، دەنووسین، چونكە نووسینی ناوی هەموویان زۆری دەوێ. جگە لەوەی ناوی هەندێ گوند و سەرتەكیەكانیانم لە یاد نەماوە.

| ناوی شوێن | ناوی سەرتەكیەی ئەو شوێنە |
|---|---|
| ١- سلێمانی | مەلا سابیری سۆفی محەمەد، لە دواییدا حاجی محەمەد ئەمینی كوێرەكانی |
| ٢- كەركووك | حەمەبۆر، لە دواییدا موحەممەد ئەمین عارەب |
| ٣- عەسكەر | كاكە ڕەزای كاكە عەلیی عەسكەر. ئاغجەلەر. |
| ٤- هەنجیرە | حەمە عەزیزی كوێخا عەبدوڵلا. مەرگە |
| ٥- دوولكان | ڕەشیدی عەلی ئاغا. سووورداش |
| ٦- سێكانیان | محەمەد عەبدوڵلا ناسراو بە حەمە شوان. سووورداش |
| ٧- سەرمۆرد | كاكەمین. سووورداش |
| ٨- قزلوو | محەمەد قوربانی. تەقتەق |
| ٩- شیلە | سۆفی نەبی. كۆیە |
| ١٠- قۆمەرغان | خوشكە خانم. سووورداش |
| ١١- بۆگد | خوشكە فاتم ناسراو بە داكە فاتە. كۆیە |
| ١٢- سێدەر | خوشكە مانە ناسراو بە مانەشەل. سووورداش |

١٣- كانی سارد خوشكه خه‌جیّ خێزانی ڕه‌شید تۆفیق ناسراو به ڕه‌شه هه‌قه. سووورداش(١٥).

(١٥) بوونی چوار ژنی سه‌ر ته‌كیه له‌ناو سێزده سه‌رته‌كیه‌دا كه دیاره له ناو تێكڕای سه‌رته‌كیه‌كاندا گه‌لیّ زیاتر بوون، به‌ڵگه‌یه‌كی به‌هێزه بۆ ڕێزگرتنی ڕێبازی هه‌قه له ئافره‌تان، له ناو كۆمه‌ڵگه‌یه‌كی پاشكه‌وتووی ده‌ره‌به‌گیدا و له هه‌مان كاتیشدا نیشانه‌ی ئه‌وه‌یه هه‌قه‌یه‌تی چ هێز و وزه‌یه‌كی خستبووه دڵ و ده‌روونی ئه‌و جه‌ماوه‌ره‌وه. ئافره‌ت له كۆڕی مندال به‌خێوكردن و گسكدانی ناومال و خاوێنكردنه‌وه‌ی گه‌وری ئاژه‌ڵ و شیردۆشین و مه‌شكه‌ژه‌ندن و جلشتن و نانكردن و چێشت لێنانه‌وه ڕاپه‌ڕی و له كۆیله‌یه‌تیی ئاشبه‌زخانه ڕزگار ببیّ و به‌ڕێنوێنیكردنی ئه‌و برۆن به‌ڕێوه. جا وه‌ره ورد به‌ره‌وه ئه‌گه‌ر كۆمه‌ڵ له‌سه‌ر ئاستی سه‌رانسه‌ری وڵات له كۆتی دیلیی بیری پاشكه‌وتووی سه‌رده‌می ده‌ره‌به‌گی ڕزگار ببیّ، ئافره‌ت چ ده‌ورێك ده‌توانیّ بگێڕیّ؟ ده‌با سه‌ری ڕێز بۆ بزووتنه‌وه‌ی هه‌قه دانه‌وێنین كه‌وا توانیی له‌و چه‌ند كیلۆمه‌تره زه‌وییه‌دا چ ڕاپه‌ڕینێك به‌رپا بكا- م.م.ك.

## بانگ ڕاهێڵەکانی هەقەیەتی

لە سەرەتای دەستپێکردنی بزووتنەوەی هەقەدا هەندێ لە موریدەکانی شێخ عەبدولکەریم بەهۆی جەزبە و حاڵ لێهاتنەوە دەستبەرداری کار و کاسبی بوون و وازیان لە ژن و ماڵیان هێنا. ئەمانە کەوتبوونە گەڕان بەناو دێهاتەکاندا لە بارەی سۆفیەتی و هەقپەرستی و تەریقەتەوە بۆ خەڵك دەدوان(١)، کە مامە ڕەزا بوو بەسەرکردەی هەقە، ئەم تاقمەی کرد بەنوێنەری خۆی بۆ ناو هەقەکان. هەر دوو کەس بەیەکەوە دەیناردن بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێوشوێنی هەقەیەتی. هەر کام لەم بەپیاوانە دەوترا (برا سەیار) واتە گەڕیدە.

ئەمانە پیاوی زۆر وریا و بەگفتوگۆ و قسەخۆش و ژیریان تێدا بوو. وەك مستەفای مەلا ساڵح لە ئیلەڵا، شێخ ئەبوبەکری شێخ عەبدوڕەحمان لە سەرگەڵوو، سەید عەلی سەید محەمەد ئەمین لە کانی هەنجیر، قادر فەرەج لە قۆمەرغان، ڕەشید مستەفا لە ناو دزەییياندا، ئەحمەد ساڵحی ناسراو بەئەحمەد شەربە لە هەڵەدن، سەید عەلی لە گەورەدێ، سەید عەبدوڵا لە سەرگەڵوو، شێخ عارف لە ئیلەڵا، شێخ محەمەدی شێخ مستەفا ناسراو بەکاکەدینە لە سەرگەڵوو، شێخ سەلیمی شێخ ئەحمەد لە سەرگەڵوو، ئیسماعیل هەنجیرەیی ناسراو بەسمایلە قووچ، ساڵح ئیسماعیل ناسراو بەساڵح مزگەر و خدر سابڵاخی و... تاد.

---

(١) مامۆستا هەمزە عەبدوڵا دەڵێ: «یەکەم جار حەمەسوور ئەو ڕێبازەی دانا بۆ هەندێ لە هەقەکان کە کار نەکەن تا بە دێهاتەکاندا بگەڕێن بۆ ئامۆژگاری و خەڵك ڕاکێشان و پڕوپاگەندەکردن». منیش دەڵێم: ئەم شێوەی بانگراهێڵ ناردنە بەملا و بەولادا بۆ ڕێ خۆشکردن و بیروباوەڕ بڵاوکردنەوە لە کۆنەوە لە زۆر بزووتنەوەی ناو موسوڵمانانمدا بووە و کاری خۆی کردووە کە ئەمەش نیشانەی کەڵك وەرگرتنی پێشەوایانی هەقەکانە لە شێوە و ڕێبازی پێشینان-م.م.ك.

ماموّستا ڕەشید محەمەد عەلی لە ژمارە (١٥)ی ساڵی ١٩٨٣ی گۆواری (کاروان)دا، ڕەخنەی ئەوەی لێ گرتووم کە لە باسی بانگڕاهێڵەکانی هەقەیەتیدا ناوی (مام سمایل)ی بەناوبانگ بە سمە زیتەم نەهێناوە. لە ڕاستیدا مام سمایل لە برا سەیارەکان نەبووە. بەڵێ، چەندی بلێی دڵسۆز و کارگوزار بووە بۆ مەسەلەی هەقەیەتی، بەڵام ناوی ئەومان لە ناو ناوی برا سەیارەکاندا تۆمار نەکرد، چونکە برا سەیار نەبووە.

ئەو کەسانەی لەمانە لە دێهاتەکاندا نیشتەجێ بوون پێیان دەوترا (موخلیس) واتە بەدڵسۆزییەوە خۆیان بەخت دەکرد وەك (حاجی ئەحمەدی سەرگەڵوو) و (حاجی مەحموودی هەڵەدن) و (سۆفی نەبیی شیلە) و (عەلی ساڵحی قەلاچۆغە)ی ئاغجەلەر و (مستەفای سەرمۆرد) و (حەمە قوربانیی قوزلوو) و (مەلا عەبدوڵای حەلەمۆرد) و (حاجی ئەحمەدی بیرئەسپان) و (سۆفی مەولوودی نۆمەرگومەت) و (حەمە عەزیزی کوێخا عەبدوڵای مەرگە) و (حاجی محەمەدی خۆشناو) و (مام عەلیی قەرەدەرە) و (حەمەبۆری کەرکووك) و (حەمەئەمین عارەب) هەر لە کەرکووك و گەلێ کەسانی تر. لە شارەکانیشدا موخلیسی ژیر و ڕۆشنبیر هەبوون وەك مەلا سابیری سۆفی محەمەد لە گەڕەکی کانی ئاسکان لە سلێمانی[٢].

لە ئەنجامی ئەم گەڕان و جموجووڵەدا چەندین جار ئەم برا سەیارانە تووشی گیروگرفت دەبوون. بۆ نموونە تاقمێکیان لە دەشتی کۆیە دەبن، لە لایەن پۆلیسەوە دەستگیر دەکرێن. ماوەیەکی زۆر لە گرتووخانەدا دەمێننەوە. هەموو جارێك کە ماوەی گرتنەکەیان تەواو دەبوو، پۆلیس داوای لە دادوەر دەکرد ماوەی گرتنەکەیان بۆ درێژە پێ بدا. دواجار کە پۆلیس ئەم داوایە لە دادوەر تازە دەکاتەوە، دادوەر تێ دەگا ئەم داوای

(٢) ئەم مەلا سابیرە پاشان چووە ڕیزی ئاشتیخوازانەوە و بوو بەیەکێ لە تێکۆشەرانی ڕێگەی ئاشتی.

بەردەوامی درێژەی پێدانە شتێکی تێدایە. دەڵێ: بیانهێنن بۆ لای خۆم، بیانبینم. کە دەیانبەنە لای و لەگەڵیان دەکەوێتە گفتوگۆ، دەیەوێت تەواو لێیان تێ بگا. ڕوو دەکاتە یەکێکیان کە ناوی ئەحمەد سالح دەبێ ناسراو بەئەحمەد شەربە و خەڵکی گوندی (هەڵەدن) دەبێ، لێی دەپرسێ: ئێوە دەڵێن: ئێمە خواناسین. باشە خواناسیی ئێوە چۆنە؟ ئەحمەد سالح لە وەڵامدا دەڵێ: خوا، خوڵ، خۆم! دادوەر دەڵێ: ئەم قسە پووچانە چین؟ ئەویش دەڵێ: قوربان خەڵکی لە ئێمە ناگەن. وام دەزانی جەنابتان دادوەر و خوێندەوارن، تێمان دەگەن. بەڵام قوڕمان بەسەر، چی بکەین؟ دادوەر دەڵێ: قسەکەت ڕوون بکەوە. ئەویش دەڵێ: خوا ئەم سەرزەمینەی داناوە. ئێمەشی دروست کردووە، واتە سێ شت گرینگە:

(١) خوا کە بنیاتنەری ئەم دنیایە و مرۆڤیشی دروست کردووە.

(٢) ئەم سەر زەمینە کە لە سەری دەژین.

(٣) مرۆڤیش کە بەندەی خوایە.

دادوەر، یەکسەر بڕیاری ڕاگرتنی کاری قانوونی بەرانبەریان دەدا. ئەگەر دادوەرەکە وریا نەبوایە، لەوانە بوو ماوەیەکی گەلێ زۆرتر لە گرتووخانەدا بمێننەوە بەخۆڕایی، چونکە هیچ تاوانێکیان نەبووە.

## چەردەیەك لە بارەی هەڵوێستی کۆمەڵایەتیی هەقەکانەوە

زۆرتری کۆمەڵی هەقە لە جووتیاران و ڕەنجکێشانی لادێ پێك هاتبوون[١] بۆیە بەرەو ژیانی هاوبەشی و تەبایی ناو کۆمەڵ دەڕۆیشتن. لە سەرەتادا هەرچەند پیاوی تێگەیشتوویان زۆر بوو، ژمارەی خوێندەواریان کەم بوو[٢]، بەرادەیەکی وا نەبوو بتوانن جووڵانەوەکەیان بە هەنگاوی خێرا بەرەو پێش ببەن، لەبەرئەوە کاتێکی زۆریان بەکۆڵینەوە و قسە و گفتۆگۆ و بەراوردکردن بەسەر برد و پاشانیش کەوتنە بەر گیر و گازی حکوومەت و خرانە بەندیخانە و لە ناوچەکانی خۆیاندا بەربەرەکانیێ کران. لەبەر ئەم هۆیانە پێیان نەکرا نەخشەیەکی ڕوون بۆ خۆیان دانێن و خۆیان باش ڕێك بخەن و بتوانن بیروباوەڕ و مەبەست و ئامانجەکانیان بۆ خزمەتی گەل و ئەو خزمەتەی دەیانویست بەگەلی بکەن لە چوارچێوەی پڕۆگرامێکی ئاشکرا و دیاردا بخەنە بەرچاو، تا خەڵکی تر تێ بگەن ئەمانە چییان دەوێ و مەبەستیان چییە. بەڵام لەگەڵ ئەوە بەگشتی دەمیان لە یەکێتی و تەبایی و هاوبەشی دەکوتا. بزووتنەوەی هەقە لە شیکردنەوەدا بەشێوەی بزووتنەوەیەکی نیمچە سۆشیالیستیی دێتە بەرچاو[٣]. وەك وتمان یەکێك لە باوەڕە هەرە بایەخدارەکانی هەقەکان ئەوە بوو نابێ لە

(١) مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا دەڵێ: «شێخ عەبدولکەریم خۆیشی کشتوکاڵی دەکرد و وەك جووتیارێك دەژیا». (بڕوانە ئەو پاشبەندە کە مامۆستا هەمزە بۆ ئەم کتێبەی نووسیوە). لە تەسکەرە عوسمانییەکەشیدا کە لە ٢٣ی مایسی ١٣٣١ (٢٣ی مایسی١٩١٧)دا بۆی دەرکراوە، لە خانەی (پیشە)دا نووسراوە (فلاح)–م.م.ك.

(٢) بگەڕێوە سەر پەراوێزی ژمارە (١١) لاپەڕە (٧٧).

(٣) دەتوانرێ بوترێ (هەقە) ڕێکخراوێکی سۆشیالیستیی خەیاڵی بوو لە کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵیدا، بێ بەرنامە و پڕۆگرامێکی دیار.

(شێخ ستار لە داوێنی ئەم پەراوێزەی کاك مستەفا عەسکەرییەوە نووسیویە: =

نێوان ئەندامانی کۆمەڵدا بەهۆی دەوڵەمەندی و هەژارییەوە، یا بەهۆی جۆر و ڕادەی دەسەڵاتی ناو کۆمەڵەوە، جیاوازیی هەبێ، واتە دژی جیاوازیی چینایەتی بوون. بۆیە لایان وابوو پێویستە هەژار و چەوساوەکان یەك بگرن[٤] و هەوڵیان دەدا کەسیان بەهەژاری لەناودا نەمێنێتەوە. هەموو یارمەتیی یەکتریان دەدا بەتایبەتی هی هەژارەکانیان. دڵسۆزی بیروباوەڕی خۆیان بوون. چەند کەسیان لە پێناوی بیروباوەڕدا لێ کوژراوە، لەمانە (مام حوسەینی کوێرەکانی) و (مام ساڵحی گۆمەشینی). هەر لەم ڕێگەیەشدا دەربەدەری و ئازار و بەندیخانەی زۆریان چەشتووە، بەڵام لە ڕێبازی خۆیان لایان نەداوە.

---

= «دەبوو کاك مستەفا هەندێ درێژەی بەم مەسەلەیە بدایە و ئەو سەرتاڵانەی بەوردی دەستنیشان بکردایە کە لای وایە بزووتنەوەی هەقە دەبەستێتەوە بەبیروڕای سۆشیالیستیی خەیاڵییەوە». کە کاك مستەفام لەم ڕەخنەیەدا ئاگەدار کرد، لە وەڵاما بۆی نووسیم: «پێشنیهادەکە پێشنیهادێکی بەجێیە، بەڵام لام وایە بەجێهێنانی لە بابەتێکی وا سەرەتاییدا ئاسان نییە، با بمێنێ بۆ هەلێکی لەبارتر» – م.م.ك.)

(٤) ئەمەی کاك مستەفا عەسکەری دەیڵێ. ئەگەر وابێ، نیشانەی پلەیەکی بەرزی هۆشیارییە، بەڵام نە خۆی بەڵگەیەکی بۆ هێناوەتەوە، نە منیش نیشانەیەکی وا بەدی دەکەم–م.م.ك.

لە وەڵامی ئەم قسانەی کاك محەمەددا، منیش–مستەفا عەسکەری– دەڵێم: ئەی ئەو جۆرە ڕێکخستنەی ئەوان لەو سەردەمەدا، بەڵگە نییە بۆ هۆشیارییان؟ ئەی ئەو یەکسانی و تەباییە کە پەیڕەوییان کردووە بەڵگە نییە کە وەك بانگەوازێك بێ بۆ یەکگرتنی هەموو چەوساوە و هەژارەکان.

## هەقەکان و نەریتە ئاینییەکان

زۆرتری هەقەکان[1] نوێژیان نەدەکرد و ڕۆژوویان نەدەگرت و گەلێك لە ڕێوشوونی ئاینییان واز لێ هێنابوو. خەڵکی دەوروپشت ئەمەیان بەنیشانەی ئەوە دادەنا کە هەقەکان خوانەناس. لە ڕاستیدا هەقەکان خوانەناس نەبوون و باوەڕیان بەخوا و پێغەمبەر و قورئان و فەرمانەکانی شەرع زۆر پتەو بوو. خۆیان وا دادەنا کە خواناسی ڕاستەقینەن و هەقپەرستن. پەند و ئامۆژگارییەکانی شێخ عەبدولکەریم و مامە ڕەزایش هەرگیز شتی وایان تێدا نەبووە کە کەس نوێژ نەکا و ڕۆژوو نەگرێ یان پێچەوانەی شەریعەت بجوولێتەوە. سۆفی و موریدەکانی شێخ عەبدولکەریم بە وازهێنان وازیان لە نوێژ و ڕۆژوو و ڕێوشوونی تری شەرع نەهێنا بوو. تەنیا ئەو تاقمەیان دەستبەرداری ئەم ڕێوشوونانە بووبوون کە ناویان لێ نرابوو (برا سەیار) کە بەهۆی حاڵەتی وەجد و جەزبەوە لە کاتی خۆیدا دەسبەرداری هەموو شتێ بووبوون، هەر لە ماڵ و منداڵ و داراییەوە بیگرە تا داوونەریتی ئاینیش و[2] وەك شێت

(١) مەبەست لە (هەقەکان) لێرەدا ئەو ڕەشە خەڵکەی دانیشتووی گوندەکانی هەقەکانە کە لە دەسەبەشکردنی دانیشتوانی ناوچەکەدا بەهەقە دادەنران، وەك پاشان دەردەکەوێ، نەك تەنیا ئەوانەی تەریقەتیان لەسەر دەستی شێخ عەبدولکەریم وەرگرتبوو–م.م.ك.

(٢) شێخ حوسێنی خانەقا لەم بارەیەوە دەڵێ: «ئەم حاڵەتی جەزبە و ئەو قسە هەلەق و مەلەقانەی سۆفی لە حاڵەتی جەزبەدا دەیانکات کە پێیان دەڵێن (شطحات)، جۆرە سەربەستییەکی بیرکردنەوە و قسەکردنی لە ناو تێکڕای هەقەکاندا کردبوو بەباو، کە ئەمەش دەبوو بەهۆی پەیدابوونی گەلێ مشتومڕی فەلسەفی لە بارەی خوایەتی و یەکێتیی گەردوون و ئەم جۆرە بابەتانەوە. یەکێ لەمانە مەلا سەلامیکوڕی مەلا مستەفای ترێخۆر بوو. ئەم زاتە حاڵەتی جەزبەکەی بە =

بەدێهاتەکاندا دەگەڕان، تەنانەت لەبەرئەوە لە زۆر شوێنیش پێیان دەوتن (شێتەکان). لە سەردەمی مامە ڕەزادا زۆرتری سۆفی و موریدەکان لەسەر نوێژ و ڕۆژووی خۆیان بەردەوامبوون و مامە ڕەزا خۆیشی لە کاتی نوێژی بەیانیدا بەسەر بەرماڵەوە تووشی نەخۆشیی مەرگ بوو(۳).

---

= عولوومی دینییەوە گرتبووی و گەیاندبوویە باوەڕ بەفەلسەفەی جەبرییە کە سەلبی جوزئی ئیختیاریش لە ئادەمیزاد دەکا. تەنانەت وای لێ هاتبوو نوێژیشی نەدەکرد و هەمیشە لەگەڵ خۆیدا خەریکی موحاکەمەتی فەلسەفی بوو. دیارە ئەم جۆرە حاڵەتە ڕێی بۆ زۆر کەسی نەخوێندەواریش بەرەڵا کردبوو هەریەکە بەجۆرێ خۆیان لە قەرەی ئەم مەسەلەیە بدەن، بەتایبەتی سێ کەس کە پاشان پێوەندییان بە مەلا سەلامەوە ئەما: ئەحمەد شەربە، ڕەزا هەڵەدنی و حەمەسوور. ئەم سیانە هەمیشە لە ناو خۆیاندا لە باسی بوون و نەبوونی خوا و شتی وادا بوون و هەرچەندە پێوەندییان لەگەڵ خەڵکدا نەبوو، مەبەستیشیان نەبوو خەڵك گوێیان لە قسەکانیان بێ یا نە. ئەمانە گەیشتنە پلەیەك دەست لە دنیا دابشۆرن و دەست داشۆردنەکەشیان وای لێ هاتبوو پێوەندییان لەگەڵ هەموو جۆرە نیزامێك بڕابوو. هەر بۆیەش نوێژیان نەدەکرد و نوێژکردنیان بەجۆرە سەردانەواندنێك بۆ ئیلتیزاماتیی دنیا دادەنا. ئەمانیش هەر چاوەڕێی هاتنی محەمەدی مەهدی بوون کە بێ و دنیای پڕ جەور و ستەم چاك بکا»-م.م.ك.

(۳) لە پوختەی ئەم بەشەوە دەتوانین بگەینە ئەوە کە چینی یەکەمی پیاوە بەڕێوەبەر و قسەڕەواکانی کۆمەڵەی هەقە - جگە لە شێخ عەبدولکەریم و مامە ڕەزا- نیمچە (باطنییەت)ێکیان تێدا بووە و بۆ خۆیانیان ڕەوا بینیوە بەپێویستی نەزانن لەسەر پێڕەوی لێکردنی نەریتەکانی ئاین سوور بن. بۆیەش شێخ عەبدولکەریم و مامە ڕەزام لەمە لاخست، چونکە شتی وایان لێ هەست پێ نەکراوە. بەڵکو بەپێچەوانەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لام وایە ئەم هەڵوێستە لە لایەن ئەو دووانەوە تەنیا تەکتیك بووە، ئەگینا ئەقڵ نایگرێ سۆفی وا بەئاشکرا لە ڕێبازی شێخ بەلەسە ببێ، کەچی هێشتا شێخ بەشێخی و سۆفی بەسۆفییەتی بمێنێتەوە و لە یەکتری جوێ نەبنەوە-م.م.ك

## گرتنی مامە ڕەزا و ڕەوتی هەقەکان بۆ کەرکووك و سەرەنجام

مامە ڕەزا توانیی کۆمەڵی هەقە زۆرتر بەرەو خۆ خەریککردن بەباری کۆمەلایەتییەوە ببات. ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی ئەو ناوچانەی باسمان کردن چوونە ناو کۆمەڵی هەقەوە یا بڵێین بوون بە هەقە. تەکیە و خانەقاکانیان لە جاران ئاوەدانتر بوون، لە هەموو لایەك باس هەر باسی هەقە بوو. ڕێکەوت وابوو لەو سەردەمەدا شۆڕشی بارزانیش لە سالانی ١٩٤٣-١٩٤٤دا بەرپا بوو. حکوومەت بەرانبەر بزووتنەوەی هەقەیش مەترسیی زیاد بوو. لە ساڵی ١٩٤٤دا مامە ڕەزای دوورخستەوە بۆ عەمارە. ئەم دوورخستنەوەیە بەجۆرێکی وا کتوپڕ بوو، مامە ڕەزا لەوە بەولاوە کە داوا لە کۆمەڵەکەی بکا دوا بەدوای ئەو بڕۆن و نەگەڕێنە دواوە تا حکوومەت ناچار دەبێ دەیگێڕێتەوە بۆ کەڵکە سماق - فریا نەکەوت هیچی تر بکا.



خانەقای کەڵکە سماق

کەڵکەسماق لەسەر ناوچەی میرزا ڕۆستەم بوو کە ئەو کاتە بەڕانیەوە و ڕانیەش بەهەولێرەوە بەسرابووەوە. سەعید قەزاز موتەسەریفی هەولێر بوو. هاتە دووکان و ناردی بەدوای مامە ڕەزادا بەناوی چاوپێکەوتنەوە. کە مامە ڕەزا گەیشتە سەر زێی دووکان، سەعید قەزاز چاوەڕوانیی نەکرد یەکسەر گرتی و سواری ئۆتۆمبیلەکەی خۆی کرد و ڕەوانەی عەمارەی کرد(١).

لەسەر داوای مامە ڕەزا، هەقەکان ماڵ و سامان و خانووی خۆیانیان هەموو فرۆشت و لە ناوچەکانی خۆیانەوە بەرەو ناوچەی ئاغجەلەر بەڕێ کەوتن.

مامە ڕەزا لای هەقەکان بەگشتی، بەتایبەت لای برا و خوشکانی مامە ڕەزایی، زۆر خۆشەویست بوو، چونکە بەشێوەیەکی ڕۆحی تێکەڵ بەهەژاران و چەوساوان بووبوو کە لەو سەردەمەدا زۆرتری جوتیارەکانی ناوچەکە هەژار بوون. پێوەندیی مامە ڕەزا لەگەڵ سۆفی و مورید و برا و خوشکی مامە ڕەزایی دوور بوو لە دەستەڵات و خۆسەپاندن، بەڵکو بەڕاستی شێوەی برایەتی و یەکسانیی وەرگرتبوو.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم شتێك، وەك بەڵگە بۆ ڕاستیی ئەم قسانەم بگێڕمەوە:

جارێکیان مامە ڕەزا و چەند برایەکی هەقە دەچنە گوندی (کانی بی) لە

(١) ئێدمۆندز کە باسی ئەم ڕووداوە دەکا دەڵێ: سەعید قەزاز ئەمەی بەبێ پرس پێکردنی بەغدا و ڕاوێژ لەگەڵ کردنی موتەسەریفی سلێمانی و کەرکووك کرد. دانیش بەخۆ ڕاگرتنی هەقەکاندا دەنێ کە تا مامە ڕەزا نەهێنرایەوە، نەگەڕانەوە بۆ دێکانیان (بڕوانەرە: سی. جی. ادموندز، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٨-١٨٩). (بەڵام شێخ حوسەینی خانەقا دەڵێ: «لەو ڕۆژەوە کە ڕێبازی کۆمەڵایەتی لە ناو هەقەکاندا دەرکەوت، ئینگلیزەکان لێیان کەوتنە ترسەوە و ئیتر هەر چییان بەسەرداهات دەستی ئەوانی تێدا بوو»-م.م.ك).

دەشتی کۆیە. پێش ئەوان شێخ عەبدوڵای عەسکەر برا گەورەی مامە ڕەزا دەچێتە گوندەکە و میوانی قادر ئاغا دەبێ کە خاوەنی گوندەکە دەبوو. قادر ئاغا لای شێخ عەبدوڵا گلەیی دەکا، دەڵێ: کە مامە ڕەزا دێتە ئەم گوندە، نایەتە دیوەخانی ئێمە، دەچێتە ماڵی مجەوری مزگەوتەکە. لەو کاتەدا یەکێك لە پیاوەکانی قادر ئاغا دەڵێ: ئەوە مامە ڕەزا بوو هات و چووە ماڵی ڕەسووڵ مجەور. شێخ عەبدوڵا دەڵێ: بچن بانگی بکەن بۆ ئێرە . کە مامە ڕەزا دەچێ بۆ لایان. شێخ عەبدوڵا دەڵێ: مامە ڕەزا! بۆچی دەچیتە ماڵی ڕەسووڵ مجەور و هاتوچۆی قادر ئاغا ناکەیت و نابیتە میوانی؟ مامە ڕەزایش دەڵێ: قادر ئاغا دۆستی تۆیە و ئەوا جەنابیشت میوانی ئەوی. من دۆستی پیاوی خاوەن دەسەڵات نیم، دۆستی هەژارەکانم، بۆیە دەچمە ماڵی ڕەسووڵ مجەور. لەبەرئەوەی مامە ڕەزا، خۆی وتەنی، دۆستی هەژاران بووە، کە ساڵی ١٩٤٤ گیرا و دوور خرایەوە، هەموو مامە ڕەزاییەکان دوای کەوتن بۆ هێنانەوەی و ڕزگارکردنی لە چنگ حکوومەت.

ماوەیەکی کەم لە دێی گۆپتەپە مانەوە تا هەموو یەکیان گرتەوە، ئینجا ڕووەو ناوچەی شوان بەڕێ کەوتن بۆ ئەوەی لەوێوە بڕۆن بۆ کەرکووك. لە نزیك گوندی حاجی بەیخان لە ناوچەی شوان حکوومەت ڕێی پێ گرتن و کاکە ڕەزای کاکە عەلی عەسکەری و دوازدە کەسی تری لێ گرتن و ڕەوانەی کەرکووکی کردن. پێش ئەوانیش شێخ محەمەد ئەمینی مەڵحە و شێخ مستەفای کوڕی مامە ڕەزا لە میرزا ڕۆستەم گیرابوون و ڕەوانەی ڕانیە کرابوون.

لە ماوەی ئەم ڕێگە دوورەدا پۆلیس هەر بەدوایانەوە بوون، جۆرەها ئازار و نارەحەتییان دەدانێ و هەڕەشەیان لێ دەکردن. بەڵام ئەوان هەر لەسەر ڕێ ڕۆشتنەکەی خۆیان بەردەوام بوون تا گەیشتنە دێی یارولی. لەوێ بوون حکوومەت بیری کردەوە و وردبووەوە ئەگەر ئەم ژمارە زۆرە لە

پیـاو و ژن و مـنـاڵ ڕوو بـکـەنـە نـاو شارەکـان، بـۆ ئـەو دەبـێ بـەمـایـەی شوورەیی[٢]، لـەبـەرئـەوە کـەوتـە گفتـوگـۆ لـەگـەڵیدان. لـە لایـەکـی تـریشەوە گـیـراوەکـان خـرانـە بـەر گـیـر و گـازی ئیدارە و پـۆلیس بـەمـەبـەستـی زۆر لـێکـردنـیـان بـۆ ئـەوەی هـاوڕێکـانـیـان قـایل بـکـەن بگـەڕێنـەوە دواوە بـۆ دێهاتەکانی خۆیان. بۆ چاوەڕێکردنی ئەنجامی ئەم گفتوگۆیە هەقەکان لـە ئۆردووگـایـەکـی چـۆڵـی هـاویـنـە کـە بـۆ مـەشق پێکـردنـی سـەربـازی حکوومـەت ئامادە کرابوو، لە نزیکی یاروەلی ئارامیان گرت. موتەسەڕیفی هەرسێ لیوای هەولێر و کەرکووك و سلێمانی بەڕێوەبەری پۆلیسی ئەم سێ لیوایە کۆبوونەوە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ کردنیان، لە لایەکی تریشەوە بۆ لەدادگەدانی گیراوەکان. لە ئەنجامدا کە بۆیان نەچووە سەر گیراوەکان تاوانبار بکەن، گفتوگۆ لە نێوان هەردوو لادا گەرم بوو، بەڵام حکوومەت هـەر بـەهـیـوای خـافـڵانـدنـی هـەقـەکـان بـوو، جۆرەهـا بـەڵێنـی دەدانـێ و هیچیشیانی بەجێ نەهێنا.

ساڵ بەرەو درەنگی دەڕۆیشت و پایز بەسەردا هات و وردە وردە ساردی کرد. نەخۆشی کەوتە ناو ئۆردووگای هەقەکان. چەند پیر و منداڵیان لێ مردن و هەر لەو ئۆردووگایەدا بەخاك سپێردران.

لە ئەنجامی ئەم بارودۆخەدا هەقەکان لە ناو خۆیاندا کۆبوونەوەیەکی گەورەی گشتییان کرد، لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیاریان دا ئیتر چاوەڕوانی نەکەن. سەرلەنوێ ڕێ ڕۆیشتنەکەیان دەست پێ کردەوە و بەرەو کەرکووك کەوتنە ڕێ. پۆلیس و ئۆتۆمبیلی چەکداری حکوومەت ڕێیان پێ گرتن و هـەڕەشەیـان لـێ کـردن ئـەگـەر نـەگـەڕێنـە دواوە تـەقـەیـان لـێ دەکـەن. وەڵامـی هـەقـەکـان بـەرانـبـەر بـەم هـەڕەشەیـە ئـەوە بـوو ئـەوان نـایـانـەوێ بـەزۆرەملـێ بەربەرەکانێی پۆلیس و هێزی چەکدار بکەن، حکوومەتیش هەرچی دەکا با

(٢) ژمارەی هەقەکان کە لە یاروەلی باریان خستبوو، دەگەیشتە ١٢ هەزار کەس.

بیکا. ئەمان ئەگەر تەنانەت هەموویشیان کوژراون ناگەڕێنە دواوە[٣].

بەمجۆرە ڕێ ڕۆیشتنەکە هەر بەردەوام بوو تا لای ڕێی هەولێرەوە چوونە ناو شاری کەرکووك و لە نزیك ماڵی موتەسەڕیفەوە باریان خست. شاری کەرکووك هەمووی بەمەسەلەکەی زانی و لێی تێ گەیشت. زۆر لە پیاوانی کوردی ناو شاری کەرکووك و خوێندەوارانی کەرکووك بەنهێنی پێوەندییان لەگەڵدا دەکردن و یارمەتییان دەدان و لە ڕووی هەڵوێستی حکوومەت و هەڵوێستی پێویست بەرانبەر بەحکوومەتەوە گەلێ شتیان بۆ ڕوون دەکردنەوە[٤].

پاش چەند ڕۆژێ حکوومەت خۆی بەناچار بینی کەوا داڵدەیەکیان بۆ پەیدا

---

(٣) ئەم خۆپێشاندانەی هەقەکان بەشێوەیەکی ناشتیخوازانە ڕێك خرابوو. تەنیا چەکی دەستیان دار بوو، هەریەکەیان دارێکی سووری بەدەستەوە بوو لە دار بەلاَّلووك یا لە داری چوالە. لەمەوە بوو هەندێ لە ناحەزەکانیان ناویان نابوون (دارەقوڵە).
(جێ پەنجەی ڕێبازی (بێ زۆر- لاعنف)ی غاندی، کە سەرچاوەی ئەویش، وەك سەرچاوەی گەلێ لقی تەسەووفی ئیسلامی، دەگەڕێتەوە سەر فەلسەفەی هیند، بەئاشکرا بەم هەڵوێستەی هەقەکانەوە دیارە-م.م.ك)

(٤) هەرچەند ئەو سەردەمە من منداڵ و قوتابیی سەرەتایی بووم، هێشتا ناوی دوو کەس لەمانەم لە یادە، یەکێکیان ئەبوبەکر ناوێك بوو، ئەویشیان وەستا سمایلێکی چەخماخساز بوو دووکانەکەی لە ئاخوڕ حوسێن بوو. ئەمانە دەهاتنە ناویان و لە چاخانەکەی یادگار-کە ئەو سەردەمە پەڕی شار بوو لەسەر ڕێی سولەیمانی- لەگەڵیان دەکەوتنە گفتوگۆ و ڕێیان بۆ دادەنان و ئامۆژگارییان دەکردن، یا بەناو کۆڵان و شەقامەکاندا بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵیان دەکەوتنە پیاسەکردن. کەسانی تریش هەبوون، بەڵام بەداخەوە ئەمدەناسین تا ئێستا ناویانم لە یاد بێ.
"ئەم قسەیەی کاك مستەفا زۆر مەنتیقی و بەجێیە و هەمیشە بەتایبەتی لە قۆناغی یەکەمدا، هەر ڕۆشنبیرانی شار ڕێی خەباتیان بۆ جەماوەری لادێ ڕوون کردووەتەوە، بەڵام کە لەم بارەوە لە مامۆستا هەمزە و کاك حوسێن خانەقام پرسی، کەسیان شتێکی ئەوتۆیان لانەبوو مەسەلەکەم بۆ ڕوونتر بکاتەوە-م.م.ك."

بکا بۆ ئەوەی لەو ڕێگەوە خەریکیان بکا و بیانخافڵێنێ و لە بەرچاوی خەڵکی شارەکەیش دەری بخا کەوا یارمەتییان دەدا و دەیانحەوێنێتەوە. چەند خانوویەکیان لە گەڕەکی (زێویە) لە پشت چایخانەکەی یادگارەوە لەسەر ڕێی کۆنی سلێمانی بۆ پەیداکردن. بەشێك لە ماڵەکان چوونە ناو ئەو خانووانە و ئەوانی تریشیان بەکۆڵانەکاندا بڵاوەیان لێ کرد.

جارێکی تر سەرلەنوێ گفتوگۆ لە نێوان حکوومەت و هەقەکاندا دەستی پێ کردەوە. وەك دەردەکەوێ ئەمجارە حکوومەت تەنگاو بوو شتێك بەدەستەوە بدا. پاش چەند ڕۆژێك گفتوگۆ، بەتایبەتی لەگەڵ گیراوەکاندا، ڕێککەوتنێك ئەنجام درا، بریتی بوو لەم خاڵانەی خوارەوە:

١- مامە ڕەزا بگەڕێتەوە بۆ شاری سلێمانی و پاش گەڕانەوەی هەموو هەقەکان بۆ ناوچەکانی خۆیان، ئەویش بگەڕێتەوە بۆ کەڵکەسماق.

٢- بەندی و گیراوەکانی هەقەکان هەموو بەربدرێن(٥).

٣- حکوومەت ئەو زیانانەیان بۆ ببژێرێتەوە کە لێیان کەوتووە.

٤- شوێنێکیان لە ناوچەی ئاغجەلەر یا بیتوێن بۆ تەرخان بکرێ بۆ تێدا دانیشتن و خانوویان بۆ بکرێ و قوتابخانە و نەخۆشخانەیان بۆ بکرێتەوە و زەویوزار بخرێتە ژێر دەستیان بۆ کشتوکاڵ تێدا کردن.

٥- هەقەکان بگەڕێنەوە دواوە بۆ ناوچەی شوان بۆ ماوەدان بەحکوومەت تا خاڵەکانی سەرەوە جێبەجێ بکا.

پاش ئەوەی نوێنەرانی هەردوو لا ئەم ڕێکەوتنەیان ئەنجام دا، مامە سەلامی برای مامە ڕەزا نێردرا بۆ عەمارە تا لەوێ چاوی بەمامە ڕەزا بکەوێ بۆ ئەوەی بەندەکانی ڕێککەوتنەکەی بۆ باس بکا و وەڵامی ئەویش بهێنێتەوە بۆ ئەمان. بۆ چاوەڕوانیکردنی وەڵامی مامە ڕەزا مۆڵەتی سێ

---

(٥) زیاد لە گیراوەکانی کەرکووك و ڕانیە و شوێنەکانی تر، هەر هەقەیەکیش لە سەربازیدا بوو- گیرابوو.

ڕۆژ درا بەهەقەکان لە کەرکووك بمێننەوە. لە کۆتاییی سێ ڕۆژەکەدا مامە سەلام فریا نەکەوتبوو بگاتەوە و وەڵامەکەی مامە ڕەزا بگەیەنێتەوە ناو کۆمەڵەکە، لەبەرئەوە ناکۆکی کەوتە ناویانەوە. هەندێکیان قایل بوون بە ڕێکەوتنەکە و بە سەرۆکایەتیی کاکە ڕەزای کاکە عەلیی عەسکەری گەڕانەوە بۆ ڕێدار لە ناوچەی شوان.

ئەوانی تریان بە ڕێکەوتنەکە قایل نەبوون و دەیانگوت مەبەسی حکوومەت هەڵخەڵەتاندنمانە و تا مامە ڕەزا نەگەڕێتەوە ناومان، ناگەڕێینەوە دواوە. ئەم تاقمەیان لە کەرکووك مانەوە. پاش ئەوەی مامە سەلام گەیشتەوە ناویان و تێی گەیاندن کەوا مامە ڕەزا بە ڕێکەوتنەکە قایلە، ئەوانیش گەڕانەوە بۆ ناوچەی شوان و بە دێهاتەکاندا بڵاوەیان لێ کرد. پاش سێ ڕۆژ ماوە درا بە مامە ڕەزا بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و دوای ماوەیەکی کەم لەوێشەوە ڕەوانە کرا بۆ هەڵەبجە و دواییش نێردرا بۆ بیارە.

حکوومەت ناکۆکیی ناو هەقەکانی بە هەل زانی بۆ پاشگەزبوونەوە لە جێبەجێکردنی خاڵەکانی ڕێکەوتنەکە. تەنیا ئەوە نەبێ مامە ڕەزای گەڕاندەوە بۆ سلێمانی و لەوێوە ناردیە هەڵەبجە و گیراوەکانیشی بەرەڵا کرد. کۆمەڵەی خەڵکەکەش بەناچاری بە هەژاری و لێ قەوماوی بەرەودوا گەڕانەوە. بەشی زۆریان نانی شێویان نەبوو. بێ ماڵ و بێ خواردەمەنی و بێ دارایی هاتنەوە بۆ ناوچەکانیان بۆ ناو خانووی ساردوسڕ. ئەو کەسانەیان کە شتێکیان مابوو یارمەتیی ئەوانی تریانیان دەدا. بەم جۆرە وردە وردە سەرلەنوێ دەستیان کردەوە بەکاسبی و ماڵ ڕێکخستنەوە. زۆری پێ نەچوو بوونەوە بە خاوەنی زەویوزار و مەڕوماڵات. چونکە ساغ و پاك بوون، خەڵکی تری ناوچەکەش یارمەتییان دەدان.

دوای ئەم سەرئەنجامەی ڕێ ڕۆیشتنەکە، کۆمەڵی هەقە تووشی نشوستییەکی گەورە بوو. ماوەیەکی زۆر کز و لاواز بوو. بەڵام هەقەکان

گوێیان نەدایە و ڕیزی خۆیانیان تێك نەدا و سەرلەنوێ دەستیان کردەوە بە ئاوەدانکردنەوەی تەکیە و خانەقاکانیان و لە ماوەیەکی کەمدا توانییان ڕیزی خۆیان وەك جاران ڕێك بخەنەوە و تەکیە و خانەقاکانیان گەرم بکەنەوە.

ڕێڕۆیشتنی هەقەکان بە چوون و گەڕانەوەوە سێ مانگێکی خایاند. هەر لە یارەوەلی ٢٥ڕۆژ مانەوە. ئەم ڕێ ڕۆیشتنە لە مانگی ئەیلوولی ١٩٤٤دا دەستی پێ کرد و لە کانوونی یەکەمدا دوایی هات.

لەو ماوەیەدا مامە ڕەزا هەر لە ناوچەکەی دوور بوو. لە ساڵی ١٩٤٩دا حکوومەت ڕێی دا بگەڕێتەوە کەڵکەسماق بەمەرجێ بەبێ پرسی ئەو بە هیچ لایەکدا نەچێ. لە ١٩٥٢دا بۆ یەکەم جار پاش ئەو چەند ساڵە ڕێی درا گەشتێك بەناو هەقەکانی ناوچەی سووورداشدا بکا.

## کۆچی دوایی مامە ڕەزا

لە ۱۹۵۳/٦/۳۰دا مامە ڕەزا لە کەڵکە سماق کوتوپڕ تووشی نەخۆشییەك بوو. لە ئەنجامی ئەوەشەوە تووشی ئیفلیجی (شەپلە) بوو. ماوەیەکی زۆر لەژێر چاودێریی پزیشکاندا بوو تا وای لێ هات بتوانێ بە یارمەتیی خەڵك و دەست بە گۆچان بەڕێوە بچێ. بەم شێوەیە مایەوە تا لە ۱۹٦۱/۲/۲٥دا لە سلێمانی کۆچی دوایی کرد و پاش ئەو کاکە حەمەی کوڕی جێی گرتەوە.

ئەمیش کۆمەڵی مامە ڕەزاییەکانی بەڕێوە برد و خزمەتی خانەقای کەڵکە سماقی کرد و پێش ئەوەیش کۆچی دوایی بکا خانەقایەکی تازەی لەسەر پارچە زەوییەکی بەر بلاو دروست کرد و بە هەر چوار دەوریدا باخ و ڕەزی ناشت. هەر لە سەرەتای شۆڕشی کوردیشەوە کە لە ساڵی ۱۹٦۱دا هەڵگیرسا، بە خۆی و هەقەکانەوە بەشداریی شۆڕشیان کرد و تا شۆڕش بەردەوام بوو ڕۆڵی بەرچاویان تێیدا هەبوو. کە لە ساڵی ۱۹۷٦یشدا سەرلەنوێ شۆڕش هەڵگیرسایەوە و تا ڕاپەڕینە مەزنەکەی ۱۹۹۱ بە لقێك پێشمەرگە بەشدارییان لە شۆڕشدا کرد.

پاش کۆچی دوایی کاکە حەمە لە ۱۹۹۷دا، شێخ هاوڕێی کوڕی خزمەتی خانەقا و خوشك و برایانی مامە ڕەزاییی گرتە ئەستۆی خۆی و تا ئێستایش بەردەوامە لەو خزمەتەیدا و لە بۆنە و جەژنەکاندا پێشوازی لەوانە دەکا کە دەچنە سەر لێدانی کەڵکە سماق.

لەم بۆنانەدا، ئەوانەی ماون یادی خۆشی ساڵانی ڕابردووی خۆیان دەکەنەوە ئەگەرچی لەو ساڵانەدا تووشی نەهامەتیی زۆریش بوون. هەروەها بیریش لە ئێستای بزووتنەوەکەیان دەکەنەوە کە لەم سەردەمەدا ڕوو لە کزییە.

## کۆتایی

بە پێویستم زانی لە کۆتاییی باسی بزووتنەوەی هەقەدا چەند مەسەلەیەك زۆرتر ڕوون بکەمەوە، چونکە لە زۆر لەو نووسینانەدا کە لەم بارەیەوە نووسراون هەندێ جار باسی ئەو مەسەلانە کراوە و هەر کەسە بەلایەکدا بیروڕا یان بۆچوونی خۆی دەربڕیوە. با لە باسی کارتێکردنی هەندێ ئاین و ئاینزا، یان بزووتنەوەی ترەوە لە بیروباوەڕی هەقەکان دەست پێ بکەین:

١- هەندێك لە نووسەرەکان وای دەردەخەن کە ئاینی بەهاییەکان کاری لەسەر بزووتنەوەی هەقەدا هەبووە. یەکێك لەو نووسەرانە مامۆستا ڕەفیق مەجید عەبدوڵایە کە لە (گۆڤارا زانکۆیا دهۆکا) هژمارا (١) پەربەندا (٢) گوڵانی ١٩٩٩دا، بەناونیشانی (حركة حقه والحمسورية والاسلام والباطنية) نووسیویە، ئەوەندەی من لەم مەسەلەیەم کۆڵیوەتەوە و بەدوایدا چووم هیچ بەڵگەیەکم لەم بارەیەوە دەست نەکەوتووە، تەنانەت ئەوەندەی ئاگەداربم ئەدەبیاتی بەهاییەکانیش هیچی وا دەرناخەن کە پێوەندییەك لە نێوان ئاینی بەهایی و بزووتنەوەی هەقەدا هەبێ. هەر بەهاییەکان خۆیشیان کە باسی هاتوچۆی بەهائوڵا بۆ سەرگەڵوو دەکەن، بەهیچ جۆرێك باسی ئەوە ناکەن کە بەهائوڵا قسە و گفتوگۆی لەگەڵ کەسێکی نەقشبەندی لەو ناوچەیەدا کردبێ. تەنانەت باسی شێخ ئەحمەدی سەرداریش ناکەن کە خەلیفەی مەولانا خالید بووە و ڕێبازی نەقشبەندیی نیشانی خەڵکی ناوچەکە داوە.

مامۆستا ڕەفیق مەجید عەبدوڵا خۆیشی هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نییە کە ئەو بۆچوونەی نیسپات بکا، گوایا باتینییەت یا بەهایی

کاریگەرییان بەسەر بزووتنەوەی هەقەوە بووبێ. تەنیا قسە لەم ڕووەوە ئەوەیە کە بەهائولا چووەتە ئەشکەوتێك لەسەرگەڵوو بۆ ئەوەی دوور بێ لە قەرەباڵغی و بچێتە خەڵوەتەوە. مامۆستا ڕەفیق مەجید دەڵێ: بەهائولا چووەتە شەدەڵە. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە بەهائولا نەچووەتە شەدەڵە. ئەو گەڕەکە ماڵەی خانەقای شێخ عەبدولکەریمیشی لێیە ئەو کاتە هەر چۆڵ بووە. حاجی شێخ مستەفای باوکی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە لە سەرەتای سەدەی بیستدا لەو شوێنەی ئێستا ماڵی شێخ عەبدولکەریمی لێیە خانەقا و خانووی دروست کردووەو ڕەز و باخی بنیات ناوە. کاتێك ئەگەر بگەڕێیتە دواوە، دیارە کە بەهائولا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا چووەتە سەرگەڵوو، واتە لای کەمی ماوەی (٥٠) ساڵێك لە نێوان ئەم دوو ڕووداوەدا هەیە: چوونی بەهائولا بۆ سەرگەڵوو و دامەزراندنی خانەقای نەقشبەندی لە شەدەڵە. جێی داخە مامۆستا ڕەفیق مەجید عەبدولا ئەوەندە خۆی ماندوو نەکردووە کە وەك مامۆستایەکی زانکۆ باسێکی ئەکادیمیی بێلایەنانە دڵسۆزانە بۆ زانست پێشکەش بکا.

من ناموێ لەمە زیاتر لەسەر ئەم مەسەلەیە بدوێم بەڵام بۆساغکردنەوەی باسەکە چەند بڕگەیەك لە وتاری مامۆستا دوکتۆر ڕەفیق شوانی وەردەگرم کە لە ژمارە (١٤٢)ی شوباتی ٢٠٠٠دا بڵاوکراوەتەوە و دەیخەمە بەرچاو. ئینجا، کورد گوتەنی، هەر کەسە خۆی و خوای خۆی. مامۆستا دوکتۆر ڕەفیق شوانی نووسیویە: «چونکە ئەم ڕێبازە و ڕێبازە ئاینییەکانی تری ناو کورد لە هەموو کوردستاندا، هەقە و حەمە سووری و نەقشبەندی دوورن لە ئینکاری حەقیقەت و ڕاستی و باوەڕیان بەتاك و تەنیایی خوا (وحدانیة الله) هەیە و لەگەڵ ڕاستی و دادپەروەری و ژیانی یەکسانی و بێ چەوسانەوەیی مرۆڤن و دژی ستەم و ستەمکارین.

بێجگە لەوەی ئەم ئاین و ڕێبازانە لە مێژووی کوردا بەبیری نەتەوەیی

کوردی دادەنرێن، بەڵام لەبەر نەبوونی دەسەڵاتی کوردی و نەبوونی دەوڵەتی کوردی تووشی گۆشەگیری و ژێر چەپۆکەیی بوونە و لە ترسی ئەوەی کە بە کافر و خوانەناس بدرێنە قەڵەم و تا بۆ ئەوەی تووشی کارەسات و قەڵاچۆکردنی یەکجاری نەبن، پەردەی لەبیرچوونەوەیان بەتایبەتی لە لایەن کورد خۆیەوە دراوە بەسەردا. لەگەڵ ئەوەشدا تووشی دەیان پرۆ پاگەندەی ژەهراوی و بێ ویژدانی بوونەتەوە».

هەروەها دەڵێ: «هەمان نارەوایی خراوەتە پاڵ هەقە و حەمە سووری، ئەگەر چی ئەم دوو رێبازە یا وەکو رێبازێکی لە ناویەك، ئیسلامی و سەر بە ئاینی محەمەدی و باوەڕیان بە هەموو بنەماکانی ئیسلامە، بەڵام چونکە لە وڵاتی کوردانەوە سەریان هەڵداوە، ئیتر جێگای تیر و توانج و رەخنەن و بە خوانەناسیان دەزانن».

مامۆستا دوکتۆر رەفیق شوانی لەسەر باسەکەی دەڕوا و دەڵێ:

«دروشمەکانیان کە بریتی بوون لە برایەتی و یەکسانی و هاوکاری و هەرەوەزیکردنی یەکتری و دادپەروەری و خواپەرستی، ئەمانە بە ئاشکرا لەناو هەقەدا پەیڕەو کراون. نهێنییان لە چیدا بووە؟». پاشان دەڵێ: «لە حاڵەتێکدا با بڵێین کەسایەتیی عەبدوڵای کوڕی سەبە ڕاستە، باشە ئەم کەسە لەسەرچاوەکاندا ئاژاوە و فیتنە و دژایەتیکردنی ئیسلام خراوەتە پاڵی، بۆچی بزووتنەوەی هەقەی خواناس و دوور لە ئاژاوەگێڕی بەزۆری زۆردارەکی لە باتینییەت و ئەم کەسە گێرەشێوێنە نزیك بکرێتەوە و بدرێتە پاڵ ئەم نارەواییە. ئایا کەس لە هەقەدا بانگەوازی دژە ئیسلامەتیی کردووە؟ داوا و بانگهێشتنی خوایەتیی کردووە؟ وەڵامەکە دیارە، شتی وا نەبووە و زۆر خواناس بوونە. پاشان زۆر هەڵەیە بڵێین (هەقە) وەکو باتینییەکان بیروباوەڕو رێبازیان لە سەرچاوەی زۆر بە زۆرەوەیە و دژی ئاینی ئیسلامە، چونکە دروشمەکانی هەقە لە شەریعەتی ئیسلامدا هەن

وەکو لەسەرەوە دیارن شەریعەتین». «پاشان کەی هەقە کەوتووەتە دوای فێڵ و جادووگەری و گرتنی ڕێبازی نهێنی و ئاڵۆز؟ هەموو ناوەڕۆکی ڕێبازەکەیان ئاشکرا و دیار بوو، تەنانەت دەست و پێ ماچکردنی شێخانیش وەکو هەیە، لای ئەوان باو نەبوو. ناوبراو لە لاپەڕە (٦٣)، ستوونی دووەمی سەرچاوەکەیدا دەڵێ: باتینییەکان ئیسلام دەڕووخێنن. باشە ئەی لە چی ڕوویەکەوە هەقە، وەکو ڕێبازێك مەبەستی ئیسلام ڕووخاندنە؟ هەقە چ بزووتنەوەیەکی لە دژی ئیسلام بەرپا کردووە؟ باشە هەقە و مامە ڕەزا بۆچی وەکو بەهایی و میرزا حوسێن لەیەك بچن و لە یەکتر نزیك بکرێنەوە؟ لێرەدا دەردەکەوێت کە ڕێبازی هەقەو مامە ڕەزایی زۆر لە ڕێبازی بەهایی و میرزا حوسێنەوە دوورن، چونکە هیچ ڕابەرێکی هەقە لە سەرەتاوە تا کۆتایی داوای پێغەمبەرایەتی یا بانگەوازی نەکردووە و خۆیانیش بە خاوەن کتێبی ئاسمانی نەزانیوە. ئەم دوو لایەنە وەك ئاسمان و ڕێسمان لە یەکترەوە دوورن. کەواتە ئیتر بەچی شێوەیەك تۆمەتی وا بدرێتە پاڵیان؟»

٢ - «لەلایەکی ترەوە ئەوەندەی من ئاگەدارم، زۆربەی نووسەرەکان کە باسی ئاین و ئاینزا دەکەن لە کوردستاندا، بە هیچ جۆرێك باسی ئەم کاریگەرییە ناکەن. بەڵام شتێکی تر هەیە پێویستە بگوترێ: هەموو ئەو ئاینزا و ڕێباز و بزووتنەوانەی لە ئیسلامدا سەریان هەڵداوە بەمەبەستی چاکسازیی ناو کۆمەڵی ئیسلام، هاوبەشن لە هەندێ باوەڕو بۆچووندا کە ئەمەش نابێتە بەڵگەی دوورکەوتنەوە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام، لادان لە شەرع، یان دژایەتی بەڵکو بەڵگەیە کە هەموو لەسەر ڕێگەی چاکەن و ئەو جیاوازییەش ڕەحمەتە. «إختلاف أمتي رحمة».

٣- لە پەراوێزی ژمارە (٦٥)ی لاپەڕە (٥٩)ی چاپی یەکەمی ئەم کتێبەدا مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم باسی (لاعنف: بێ توندوتیژی)

دەکات. ڕاستییەکەی، وەك باسمان کرد، هەقەکان باوەڕیان بە دژایەتی و بەکارهێنانی چەك یان زۆر نەبوو، بەڵکو ئەوان لەو بزووتنەوانەی ناو ئیسلام بوون کە باوەڕیان بە چارەسەرکردنی گرفتەکان بوو لە ڕێگەی گفتوگۆوە، ئینجا ئەمە لە ئەنجامی کاریگەریی فەلسەفەی هیندیدا بووبێ یان نا، ئەوە شتێکی ترە دەگەڕێتەوە بۆ سەر فەلسەفەی سۆفیەتی و پەیڕەوی خواناسی و کردەوەی چاکە، دوور لە زۆرداری.

٤- لە چەندین شوێنی ئەم کتێبە و نووسینی کەسانی تریشدا باسی ئەوە کراوە کە شێخ عەبدولکەریم و دوای ئەویش مامە ڕەزا بەهیچ جۆرێك ڕێگەی ئاینیان بەرنەداوە. نوێژیشیان کردووە و پەیڕەویی ئاینی پیرۆزی ئیسلامیان مەبەست بووە. خۆ ئەگەر چەند سۆفییەك یان برا سەیارێك لە ڕووی دڵسۆزی و جەزبەوە یان تێنەگەیشتنی تەواوەوە، هەندێ قسەیان کردبێ یان دەربڕیبێ، ئەوە شتێکی گشتی نەبووە و داونەریتی هەقەکان نەبووە. بەڵام دەبێ ئەوەیش لەیاد نەکەین ئەوانەی بە قووڵی دەچنە ناو فەلسەفەی سۆفیەتییەوە، زۆر جار بەشێوەیەکی فەلسەفی قسە دەکەن کە خەڵکی ئاسایی تێیان ناگەن و قسەکانیان بەخراپ لێك دەدەنەوە، وەك دەگێڕنەوە حەلاج پارەیەك دەخاتە ژێر پێی خۆیەوە و دەڵێ: خواکەتان لە ژێر پێمدایە. خەڵکەکەی دەوروبەری هەموو تووڕە دەبن و پەلاماری دەدەن ئەویش پێی هەڵدەبڕێ و پارەکەیان پیشان دەدا و دەڵێ: ئێوە دنیا پەرستن، ئاگەتان لە خوا نەماوە. ئینجا ئەم جۆرە قسە فەلسەفییانە لەناو سۆفییەکاندا باوە، لێکدانەوەی بە هەڵە کارێکی ناڕەوایە.

٥ - مامۆستا ڕەشید محەمەد عەلی چەند ڕەخنەیەکی لە ناوەڕۆکی ئەم کتێبە گرتووە کە مایەی سوپاسە و هەندێك کەموکورتیی چاپی یەکەمیشی کە لەم چاپی دووەمەدا چارەسەر کراون، باس کردووە:

أ- له باسی حەمە سوورییەکاندا کە دەڵێ دەبوو زۆرتری لەسەر بڕۆین.

منیش دەڵێم: هێڵە سەرەکییەکانی تاقمی حەمە سوور باس کراون، جا لەلایەن منەوە یان لەلایەن بەڕێز دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵەوە. تەنیا مەسەلەی قەدەغەکردنی منداڵ بوون باس نەکرابوو چونکە هیچ زانیارییەکی ئەوتۆم لەم بارەیەوە بە دەست نەکەوتبوو کە هۆی قەدەغەکردنەکە یان شێوەی ئەو قەدەغەکردنەیان چۆن بووە؟ لەبەر ئەو هۆیە من خۆم لە قەرەی مەسەلەکە نەدا. بەڵام کە مامۆستا ڕەشید باسی کرد، منیش لەم چاپەدا شتێکم خستە سەر قسەکانی ئەو.

ب- لە بارەی کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریمەوە تەنیا ئەوەندە دەڵێم:

تا ئێستا ئەوەندە ئاشکرا بووە کە خەڵکانێك بە هاندانی ئینگلیزەکان و دەستەڵاتدارانی ئەو سەردەمە ئەو کارەیان ئەنجام داوە، بەڵام من هیچ بەڵگەم بە دەستەوە نییە و وردەکاریی ئەم مەسەلەیەیش نازانم. هەر لەبەر ئەوەیش بوو لە چاپی یەکەمدا زۆر لەسەر مەسەلەکە نەڕۆیشتم.

ج- لە بارەی ناونەهێنانی کوێخا سمایلی مەلا سەفییەوە لە چاپی یەکەمدا، هەر لەبەرئەوە بووە کە ئەو هەموو خەڵکە زۆرە، وەك برا سەیارە و برای موخلیس و شێخان. هتد ناونووس ناکرێن ناویان لە دووتوێی کتێبێکدا، نانووسرێ، مەسەلەکە دەبێتە سەرژمێرکردن. ئەگینا کوێخا سمایل و دەیان کەسی تریش هەبوون و هەیانە تا ئێستایش ماون، دەبوو ناویان بێت، چونکە برای دڵسۆز بوون و خزمەتی ئەو بزووتنەوەیەیان کردووە.

٦- هەندێ کەس وادەزانن یان دەیانەوێ وای نیشان دەن کە بزووتنەوەی هەقە کەوتووەتە ژێر کاریگەریی بیری سۆشیالیزم و کۆمۆنیزمەوە. لە ڕاستیدا ئەم بۆچوونە، کاتی خۆی، لە سەرەتای سەرهەڵدانی بزووتنەوەکەدا، چەکی دەستی ئینگلیزەکان و ڕژێمی ئەو سەردەمەی

عێراق بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەقەکان. مامۆستا شاکر فتاح گوتەنی «ئینگلیزەکان و فەرمانڕەواییی عێراق لە هەقەکان کەوتنە مەترسییەوە. وایان تێ گەیاندبوون کە هەقەکان (کۆمۆنیستن)» تاد. بڕوای یەکسانی و هاوبەشی لە ژیانی هەقەکاندا وا لێ کدرابوەوە کە بەهۆی باوەڕی مارکسییەوە بێ، بەڵام ئەم بزووتنەوەیە، لە سەرەتادا بەشێوەی ئاینی و سۆفیەتی سەری هەڵداوە، هەروەك لە زۆر شوێندا ئەم مەسەلەیە ڕوون کراوەتەوە. من وا دەزانم ئاشکرایە ئەم ژیانی هاوبەشی و یەکسانییە لە ژێر کاریگەریی ئاینی ئیسلامدا بووە زۆرتر لە شتێکی تر. لە سەرەتای ئیسلامەوە کەسانی وەك (أبوذر الغفاري) بانگراهێڵی ئەم بیرۆکانە بوون، بەڵام دوای گەشەکردنی بزووتنەوەکە، دەست کراوە بە چارەسەرکردنی گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکان و بە تایبەتی لەناو جووتیاراندا کە هەر ئەو بوارە لەژێر دەستی هەقەکاندا بووە، تا چاکسازیی تێدا بکەن.

بزووتنەوەی هەقە، لە ڕاستیدا بزووتنەوەیەکی سەربەخۆ بووە. ئەگەر پێوەندیی دۆستایەتی و هاوکاریی لەتەك حزبێك یان لایەنێکدا بووبێ، ئەوە وا ناگەیەنێ بووبێتە بەشێك لەو حزبە یا ئەو لایەنە، یان باوەڕی وەك باوەڕی ئەو وا بوویێ. ئاشکرایە ئەم بزووتنەوەیە پێوەندیی بە زۆر کەسیەتیی نەتەوەپەروەر و نیشتمانپەروەرەوە بووە. هەروەها لە تەك حزب و لایەنەکانیشدا: شێخ مەحموودی نەمر، کۆماری مەهاباد، بارزانییەکان، شیووعییەکان، پارتی دیموکراتی کوردستان، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. هەقە پێوەندی لەگەڵ هەریەك لەمانە، لە کاتی خۆیدا بووە. ئەم قسانەی منیش بۆ پاکانەکردن نین بۆ هەقە، بەڵکو تەنیا ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکانن. ئەگینا پێوەندیی لەگەڵ حزبێکی تێکۆشەر و نیشتمانپەروەری وەك حیزبی شیووعی، ئەگەر مایەی شانازی نەبێ، جێی ڕەخنە نییە. هەروەها لە بارەی بیروباوەڕی مارکسییشەوە. جا بۆیە

دەتوانین، بە دڵنیاییەوە بڵێین ئەم بزووتنەوەیە بزووتنەوەی هەقەکان خۆیان بووە و سەر بە هیچ لایەنێك نەبووە لە بیروباوەڕیدا و لە ڕێبازی نەقشبەندی و سۆفییەتییەوە هەڵقوڵاوە.

٧- بابەتێکی تریش هەیە لە چاپی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسی لێ نەکراوە، ئەویش بە هەڵەچوونی هەندێ ڕۆشنبیرە کە لە بارەی هەقەوە نووسینیان هەیە. بۆ نموونە مامۆستای خوا لێخۆشبوو شاکیر فەتاح کە لە ساڵی ١٩٤٦دا قایمقامی چەمچەماڵ بووە و لە هەر کوێ بەڕێوەبەر یا قایمقام بووبێ ڕۆژنامەیەکی دیوارکۆی بۆ خەڵکی ئەو شوێنە بە دەستنووس دەرکردووە و لە شوێنێکی گشتیدا کردوویەتی بە دیواردا تا خوێندەوارانی ئەو شوێنە بیخوێننەوە. مامۆستای ناوبراو لە چەند شوێنێکی ڕۆژنامەی (چەمچەماڵ)دا بەشێوەیەکی ناشایان باسی هەقەی کردووە و بە ڕەوشت ناشیرین و ئاژاوەنەرەوەی ناو بردوون. بەڵام خۆشبەختانە هەر خۆی لە ژمارە (١٠٥)ی ساڵی (١٩٨٥)ی گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)دا، لە وتاری (ئاوێنەی ژیانم)دا دەڵێ: «لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی دوورو درێژدا، بۆم دەرکەوت کە ئەو بەندوباوەی بۆ هەقەکانیان هەڵبەستبوو، سەرچاوەکەی لە ئاغاواتی پشدەرەوە بوو. هۆی ئەمەش نەك تەنیا زەویوزار دەستکەوتن بوو، بەڵکو تۆڵەسەندنەوەش بووە لە شێخە هەقەکان کە توانیویانە بەشێکی زۆر لە دانیشتوانی گوندەکانی ئاغاکانی پشدەر بکەن بە دەستە و دایەرەی خۆیان. سێ جار چوومە ناو هەقەکان، تێکەڵیان بووم، لەگەڵ شێخەکانیشدا گفتوگۆم کرد. هەقەش لە بنچینەدا لقێکە لە (تەسەوف). لە شێوەی ئێستایدا شتێکە لە شێوەیەکی بچووکدا وەك (یاسای بەشداری: النظام الاشتراکي) وایە. هەرکەس هەژار بێت دەستی دەگرن، ناهێڵن کەس لە برسانە بمرێ. هەموو دەم و دین پاك و خاوێن، بەڵکو ڕازاوە بوون. دارێکیان بەدەستەوە بوو لە باتیی چەك

# پاشبەندی یەکەم(١)

بە خامەی:

مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا

کە لە شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەی پیری کۆمەڵی سۆفییەکانی هەقەیان پرسی، لە کاتی داوەریکردنیدا لە کەرکووك، ئیشی چییە؟ وەڵامی دایەوە: جووتیارم. کە لێیشیان پرسی: ئەی هەقە شوێن کەوتووەکانی چین و چ کارەن؟ وەڵامی دایەوە: برامن و مریدی باوك و باپیرمن و هەقی ئەوەیان بەسەرمەوەیە چاودێرییان بکەم و ئامۆژگارییان بکەم رێگەی چاکە و رەوشت باشی بگرنەبەر.

ئەوانەی ئاگایان لە مەسەلەکەیە تێکرا لەو باوەڕەدان شێخ عەبدولکەریم زۆر چاك دەیزانی ئەم قسە دووسەرەی کارێکی وا دەکاتە سەر چ حکوومەت و چ کۆمەڵانی جووتیارەکان و رەنجبەرەکانی لادێ کە متمانە پەیدا بکەن ئەم رێبازەی ئەو گرتوویەتیەبەر و سۆفیەتیی بۆ کردووە بە بنەڕەتی ئایدیایی، بۆ ئەوەیە جووتیاران لە گەلێ لەو جەور و ستەمانە رزگار بکا کە لەسەر دەستی ئاغا و بەگە زەویوزاردارەکان و بازرگانە سوود و سەلەم خۆرەکاندا دەیانچێشت، کە سەوزخڕ تووتن و چەڵتووك و پەمووەکانیان بە هەرزان بە سەلەم لێ دەکڕین و قازانجێکی زۆریان لێ دەخستە گیرفانی خۆیان و هەندێکیشیان لێ دەدا بە ئاغە و بەگەکان، هەروەها بۆ ئەوەیشە ئەو هەموو خەرج و باجەیان لە کۆڵ بکاتەوە کە دەبوو بەپێی داونەریتی کۆنی خێڵەکی پێشکەشی ئاغا و بەگەکانیان بکەن و وەك بەشێ لە شیربایی ئافرەتی بەشوودراو و کاری سوخرە

---

(١) مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا ئەم پاشبەندەی بە عەرەبی بۆ نووسیبووین. من خۆم وەرم گێڕایە سەر کوردی-م.م.ك.

وبێگار و مەڕانە و دیاریی تری وەك ڕۆن و پەنیر و کەرە و مریشك و میوە و شتی وا کە بۆ دیوەخانی ئاغا و بەگ دەبرێ. کەواتە دەتوانین، بێ ئەوەی ترسی کەوتنە هەڵەمان ببێ، بڵێین کاکڵی بزووتنەوەی هەقە ئەوەیە بزووتنەوەیەکی جووتیاران بوو بە مەبەستی ڕزگاربوونیان لە پێوەندی پڕ لە جەور و ستەمی کۆمەڵایەتی و خوێنمژانەی کۆن.

لەم مەیدانەدا کۆمەڵی هەقە دەسکەوتی زۆریان لەو گوند و ناوچە کشتوکاڵییانەدا، کە بەشێکی زۆریان لە خۆیان تێدا بوو – وەدەست هێنا.

بەڵام لەو ناوچە و گوندانەدا کە زۆرتری دانیشتووانیان لە خۆیان نەبوون، هەقەکان کۆچیان دەکرد بۆ ئەو ناوچانەی بەشی زۆری هاوڕێکانی خۆیانیان تێدا دەژیان، مەگەر خاوەن موڵك دەستبەرداری ئازاردان و چەوساندنەوەیان بوایە و مەترسی و ناڕەحەتی لە ڕێ لایدانایە و مەیدانی ئیشکردنی بێ سەرئێشەی بۆ برەخساندنایە، ئەوە لەو حاڵانەدا لە شوێنی خۆیان دەمانەوە و کۆچیان نەدەکرد. زۆریش وا ڕێك کەوتووە ئاغاکان هەقەکانیان خۆش ویستووە و لێیان ڕازی بوون، چونکە ئەمان دڵی ماڵ و منداڵ و بەتایبەتی کوڕ و کچە لاوەکانی ئاغەکانیان ڕادەکێشا بۆ لای خۆیان و، ئەوانیش کاریان دەکردە سەر دڵی ئاغەکانی باوکیان و کارێکیان لەگەڵ دەکردن لەگەڵ هەقەکاندا باش بجووڵێنەوە.

ڕێبازی هەقە بۆ کوڕ و کچە لاوەکانی ئاغەکان بووبوو بە دەروویەکی خێر و لێیەوە لە داوونەریتی کۆمەڵایەتیی کۆن ڕزگار دەبوون کە بینەقاقەی گرتبوون و ناچاری نوێژ و ڕۆژووی دەکردن و ڕێگای نەدەدان خۆشی لە تەمەنی هەرزەکاریی خۆیان ببینن.

ڕەوشتی هەقە لە مەیدانی پێوەندیی کۆمەڵایەتی و داوونەریتی کۆنی ناو جووتیاراندا، بەتایبەتی لە مەسەلەی ئافرەتدا، بەرزگارکردنی ئافرەت لە کۆت و زنجیری قورسی کۆمەڵایەتیی کۆن و ڕێگەدانی کە بە ئارەزووی

خۆی هاوبەشی ژیانی خۆی هەڵبژێرێ – مەترسییەکی زۆری بۆ چینی فەرمانڕەوای لادێ وەك ئاغا و بەگ و خاوەن موڵکە گەورەکان و سەرەك خێڵەکان و بەناو مەلا کۆنەکارەکان و شێخەکانی تەریقەت، تەنانەت شێخەکانی تەریقەتی نەقشبەندیش، پەیدا کردبوو. ئەمانە هەموویان بەهۆی ڕەوشتی هەقەکانەوە لێیان ڕاست بووبوونەوە و کەوتبوونە دوژمنایەتی لەگەڵ کردنیان و داو بۆنانەوەیان لای حکوومەت، بەڵکو تەنانەت یەکێکی وەك شێخ مەحموودی پێشەوای بەناوبانگیش لە ڕوویاندا وەستا.

لە ئاین و شەریعەتی ئیسلام یاخیبوونی هەقەکان، مەلایەکی زانای بەناوبانگی وەك مەلا شەریفی ئۆمەرگومەتیی خستە سەر سەودای ئەوە بچێ بۆ شەدەڵە بۆ ئەوەی شێخ عەبدولکەریم بکوژێ و موسوڵمانان لە بێ شەرعییەکانی ڕزگار بکا، کەچی سەیر ئەوەیە ئەم پیاوە کە خۆی تەرخان کردبوو بۆ ئەم (خێر و حەسەناتە)، هەر کە بۆ یەکەم جار چاوی بە شێخ کەوت، بۆ خۆی بوو بە مریدێکی گوێڕایەڵ و ئەڵقە لە گوێی و بوو بە بەڵگە و نیشانەی دەسەڵاتی ڕۆحیانەتی و لە دادگەی کەرکووکدا بە (خاتەمولئەولیا)ی ناوبرد.

ئەمەی خاوەنی ئەم کتێبە دەیڵێ کە گوایە هەندێ ئاغە و بەگ بووبوون بە هەقە، لەوە زیاتر نەبووە کە سێ ئاغا بوون بە هەقە. یەکێکیان مەحموود ئاغای میراودەلی بوو کە یەکێ بوو لە دەوڵەمەندە گەورەکانی ناوچەی بژدەر و لەوانە بوو کە زۆر لەمێژبوو تەریقەتیان لەسەر دەستی شێخ عەبدولکەریمدا وەرگرتبوو. ئەمە تا مردیش ڕەوشتی دژی ڕەوشتی سۆفییەکانی هەقە بوو، نوێژی دەکرد و ڕۆژووی دەگرت و حەجیشی کرد و زەکاتیشی دەدا. هەر بۆیەش ملپێچیی لە هەقەکان نەکرد، لەگەڵ ئەوەیش کە بێ شەرعییان لێ دەوەشایەوە، چونکە شێخ خۆی نکووڵیی لێ نەکردن و دەستی لێ دانەشتن. ئەو دووانەکەی تریشیان جەمیلی عەلۆی

دزەیی و شێخ حەسەنی شێخ عومەری خانەقا بوون، کە خاوەن موڵك و نیمچە دەرەبەگ بوون. ئەمانە لە ئەیلوولی ١٩٤١دا بوون بە هەقە و بۆیەش بوون بە هەقە چونکە حەزیان لە دوو کچی جوانی هەقە کردبوو، بەڵام کچەکان وتبوویان تا نەبن بە هەقە شووتان پێ ناکەین.

(خوا خۆشویستن)ی سۆفییە نەقشبەندییەکان، بەش بەحاڵی هەقەکان، لە خۆشەویستیی ئافرەتدا ڕەنگی دابووەوە، جا زیاتر ئافرەتی هەقە و کەمێکیش ئافرەتی تر.

ئەم عەشقی بە ئافرەتەوە گیرساوەوەی هەقەکان، کە ئەوان خۆیان بە (عەشقی خوایی)یان دەدایە قەڵەم، زۆر جاریش دەبوو بەهۆی پێوەندیی زایەندی لەنێوان پیاو و ئافرەتدا. ئافرەتی ئاشقی هەقە خۆی لە مێردە شەرعییەکەی حەرام دەکرد و پێی دەوت (برا) وەك چۆن بە پیاوی ئاشقی هەقەیشی وا دەوت.

هەقەکان، ئەوی هەقە نەبێ، بە (مونکیر)ی دادەنێن. بەڵام ئەگەر بە دڵ لە گەڵیان بێ، با نەشبووبێ بە هەقە، ئەوە پێی دەڵێن (موخلیس) و وەك خۆیان مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، نەك وەك (مونکیر).

بەلای منەوە سێ شت بوون بە هۆی بڵاوبوونەوەی هەقەیەتی لەناو جووتیاران و ڕەنجبەرانی ناوچەیەکی بەربڵاوی کوردستانی باشووریدا.

یەکەم: ڕزگاربوونیان لە پێوەندیی کۆمەڵایەتی و چەوساندنەوەی دەرەبەگییانەی لە کۆنەوە ماوە و یاخیبوونیان لەم جۆرە پێوەندییە بەجۆرێ هیچ ئازار و جەزرەبەیەکی ئاغە و بەگەکان و حکوومەت هیچ دادێکی لە ئاستیدا نەدا.

دووەم. ڕزگاربوونی ئافرەت لە کۆت و زنجیری قورسی سلانی ساڵ.

سێیەم: ئەو هاوکارییە برایانە بەسۆزەی نێوانیان کە نە کوردستان و نە هیچ ولاتێ لە ولاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست هەرگیز بەخۆیەوەی

نەدیبوو، ئەو هاوکارییەی کە ماڵ و موڵك بێ بایەخترین شت بوو لە پێناویدا بکرێ بە قوربانی.

بزووتنەوەی هەقە لە کرۆکەکەیدا بزووتنەوەیەکی جووتیارانە و هیچ پێوەندییەکی بە بزووتنەوە نیشتمانپەروەر و شۆڕشگێڕەکانی ئەم سەردەمەوە نییە و ڕێگەی بەربەرەکانێی ئاشتیخوازانەی گرتبووەبەر. هەرگیز چەکی لە ڕووی حکوومەت و کۆمەڵگای کۆندا هەڵنەگرت، مەگەر بێین (دارە قوڵە)کەی دەستیان بە چەك دابنێین، بەپێچەوانەی بزووتنەوەی بارزانەوە[٢] کە چەك و بەربەرەکانێی سەخت هۆی گەورەی دەستی بوون.

(٢) شێخانی بارزانیش سەر بە تەریقەتی نەقشبەندین–م.م.ك.

## پاشبەندی دووەم

به خامەی: د. عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ

ساڵ ١٩٤٥ یا ١٩٤٦ بوو. عەسرێك باوكم ( مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسووڵ – سەفوەت) لەسەر سەكۆی مزگەوتەكەی خۆمان (مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسووڵ كە بە مزگەوتی "باشچاوەش"یش ناو دەبرا و لە جێی گۆڕەپانی ئێستای لای حەمامی نالیدا بوو)– دانیشتبوو. لەوە دەچوو چاوەڕێی میوان بێت. ئەوەندەم زانی مامە ڕەزا هات، مەلا سابیر و پیاوێكی تری لەگەڵدا بوو. باوكم بە ڕێزلێگرتنێكی زۆرەوە پێشوازیی كرد.

ئەوەی لەبیرمە: مامە ڕەزا ڕووی كردە باوكم و وتی:

– مەلا مستەفا، تۆ نەوەی مەولانا خالیدی. بۆ تۆ نەدەشیا ئەو قسانە بە ئێمە بڵێی.

باوكم وەڵامی دایەوە:

– مامە ڕەزا ئێوە دەبێ حوكمی ئیسلامتان بەسەردا بدرێ.

مامە ڕەزا وتی: بۆ چ ئێمە موسوڵمان نین؟

باوكم وتی: موسوڵمان چۆن تەركی نوێژ دەكا و بە موریدەكانی دەڵێ نوێژ نەكەن؟ تەواو وەڵامەكەی مامە ڕەزام لەبیرە كە وتی:

– مامۆستا خوا فەرموویەتی: «وأعبد ربك حتى يأتيك اليقين». حەتا ئەداتی بلووغی غایەیە. ئێمە گەیشتووینە غایە. یەقینمان پەیدا كردووە. ئیتر پێویستمان بە عیبادەت نییە.

لەو دانیشتنە ئەوەندەم لەبیرە، بەڵام لەوەودوا زۆرم لە باوكم دەبیست دەیگێڕایەوە دەیوت:

لەو سەردەمەدا كە مامە ڕەزا نەفی كرابوو، هەقە – وەك خەڵك دەیانوت – دارە قوڵەیان هەڵگرتبوو و ڕوویان كردبووە شام. ئەو كاتە مستەفا عومەر وەزیری ناوخۆ بوو، هاتبووە سلێمانی. مەلاكانی سلێمانیی

کۆکردبووەوە، پرسی ئەوەی لێ کردبوون کە چی بکەن بۆ چارەسەری ئەم مەسەلەیە؟ هەندێك لە مەلاکان وتبوویان: ئێوە، مامە ڕەزا و یەك دووانێکی تر لە سەرۆکەکانی هەقە بکەن بەدارا، ئیتر ئەوانی تر سووك سووك واز دێنن و دەگەڕێنەوە.

هەروەها دەیوت:

موتەسەڕیف مارف جیاووك بوو، لەم پێشنیهادە زۆر تووڕە بوو. دیفاعی بۆ مامە ڕەزا و ئەوان کرد، بەڵام ئەوەندەشی وت:

– ئەی بۆچی داوای بەداراکردنی سەید ئەحمەدی خانەقا ناکەن؟ ئەی ئەویش هەقە نییە؟

باوکم دەیوت:

– من خاوەنی ئەم پێشنیهادە نەبووم، بەڵام کە بەو جۆرە بۆ مامە ڕەزایان گێڕابووەوە، من نەئینکارم کرد و نەوتیشم خاوەنی پێشنیهاد کێیە و بەو جۆرەش وەڵامم دایەوە (کە باس کرا).

***

چەند ڕۆژێك پێش ١١ی مارتی ١٩٧٠، شێخ محەمەدی جەباری (شێردەرە) نامەیەکی شەهید فاخیر مێرگەسووریی بۆ هێنام. فاخیر نووسیبووی:

«نازانم دنیا چیی لێ دێ. ئەگەر بەرەو باشی نەڕوا، لەمە نزیکتر نابمەوە لێت. لەبەرئەوە حەزدەکەم سەرێکم لێ بدەی. وا دەزانم هاتنەکەت سوودی زۆر دەبێ».

هەر بۆ سبەینێ لەگەڵ شێخ محەمەد چووینە کەرکووك. لەوێوە جێبێکمان گرت و ڕوومان کردە گوندی کلاوقوت. باسی ئەو دیتنەی فاخیر گەلێك لاپەڕەی یاداشتی گشتی و تایبەتیم دەگرێتەوە. ئەوە بۆ دەرفەتێکی تر، بەڵام ئەو بەشەی بۆ نێرە دەست دەدا، ئەمەیە:

حەمە سووری ڕابەری بەرەی حەمە سووریی هەقە لەو گوندی کلاوقوتە

دەژیا. ئەو چەند ڕۆژەی مانەوەم لە کلاّوقوت، بەشێکی زۆری سەرنج و لێ وردبوونەوەم بۆ ئەوو ژیان و ڕێبازەکەی تەرخان کرد. شتێك کە لە باسی ئەودا لەم کتێبەدا نەوترابێ، ئەمەیە:

حەمە سوور لە پاڵ ساکاری و بە واتە نەخوێندەواریی خۆیدا، زۆر لە پێڕەوەکانی خۆیی لە شێوەی هەندێ شیعری سەر بە کێشی فۆلکلۆردا باس دەکرد. لەو شتانەی لەبیرمن ئەوە بوو کە لە دێڕێکدا دەڵێ:

من خالیدی کوردم هەبێ (دیارە مەبەستی مەولانا خالیدە)

بەلای کەسی تردا ناچم

هەروەك لە شوێنێکدا کە باسی ئاینی خۆی دەکا بە (ئەم دینە)ی ناودەبا کە لە ژوور (ئاینی نەوەوی)یە (دیارە مەبەستی ئیمامی نەوەوی)یە.

ویستم شتێك لە قسەکانی حەمە سوور تۆمار بکەم، بەلاّم فاخیر وتی: لێم بگەڕێ من بەهێمنی هەموویت بۆ تۆمار دەکەم. وەك زانیم و ئاگەداری کردم زۆر شتی تۆمار کردبوو، بەلاّم نازانم ئەو تۆمارانە پاش مەرگی تراجیدیاییی خۆی چییان لێ هات؟

لە هەقەکانی کلاّوقوت محەمەدی مەلا عوبێدم لە هەموان بە بەدیمەنتر و هۆشیارتر هاتە پێش چاو. ئەو زۆر قسەی بۆ کردم. دەیوت:

«ئەوەتی ئێمە هاتووینە سەر ئەم دینە، بچووك پێش گەورە نەکەوتووە. کەس بەکەسی نەوتووە درۆ دەکەی. موڵك و ماڵمان کردووە بەیەك. تا بتوانین لەیەك مەنجەڵ نان دەخۆین».

هەقەکان بەشەو کۆدەبوونەوە، ئەرك و کاری سبەینێیان لە نێوان ژن و پیاوی گوندەکەدا دابەش دەکرد. پارە لای حەمە سوور بوو. دەیانوت ئەوی نەخۆش بێ پارەی دەداتێ و دەینێرێ بۆ شار. ئەوی ژنی نەهێنابێ ژنی بۆ دەهێنێ. ئەم بارە هەرەوەزییە لەو چەند گوندەدا کە سەر بە حەمە سوور بوون حاڵ و بارێکی خۆشتری دروست کردبوو. پێش خەڵکی تر تراکتۆر و

مەکینەی تری کشتوکاڵیان کڕیبوو. هەمووی موڵکی گشتی بوو. ژیانیان لە خەڵکی تر ڕێکوپێکتر بوو. بۆ نموونە سەرلەبەیانی فاخیر ناردبووی بۆ تراکتۆرێك بۆ شت گواستنەوە. حەمە سوور هاتە لای و وتی:

«کاك فاخیر! لەمەودوا کە ئیشتان بەتراکتۆر بوو، سەرلەئێوارە ئاگەدارمان بکەن، چونکە ئێمە شەو بڕیاری کاری بەیانی دەدەین».

***

لەم تێبینییانەوە دەگەمە هەندێ ئەنجام. بەڵام پێش ئەوە دەبێ بڵێم تا ئێستا نووسین لەبابەت هەقەوە هەر ئەوە بووە کە مامۆستا هەمزە عەبدوڵا نووسیویە و و ون بووە.

ساڵی١٩٥٦ لە بەغدا لەگەڵ کاك مارف خەزنەدار یەکترمان دەدی. بەهۆی منەوە لەگەڵ کاك محەمەد کەریم فەتحوڵڵایش بوو بە دۆست. ئێوارەیەك هەرسێکمان بۆ سۆراخی کڕینی تکتی گەشتی ئێرانی کاك مارف چووینە کازمیە. باس باسی ئێران بوو. هاتینە سەر باسی ئەو ساڵنامانەی لە ئێران دەردەچوون و شێوەی ئینسیکلۆپیدیایان هەبوو. بڕیارمان دا ساڵنامەیەکی کوردی دەرکەین. هەرسێکمان بووینە لیژنە و بانگەوازێکمان بڵاوکردەوە. کاك مستەفا ساڵح کەریممان کرد بە نوێنەر و پەیامنێری لیژنەکە لە سلێمانی. قۆڵمان لێ هەڵکرد و کەوتینە کەرەسە کۆکردنەوە. لەو شتە بەنرخانەی کاك محەمەد هێنانی، لێکۆڵینەوە بەنرخەکەی مامۆستا هەمزە بوو لە بارەی هەقەوە. هەروەك باسێکی بەنرخی کۆچکردوو یووسف مەتی (أبو زیدون)یشی بە ناوونیشانی (من سومر الی شمر) هێنا. لەیادمە چوومە ناوچەی سووورداش، گەلێك وێنەم گرت، بە تایبەتی ئەشکەوتەکانی قەمچووغە و جاسەنە (کە بۆ باسی مەڵبەندی هەقە و باسی شۆڕشی شێخ مەحموود دەست دەدەن).

ڕۆژگار وا هات من ناچاری وڵات بەجێهێشتن و چوونە شام بووم. کاك محەمەد ناچاری خۆشاردنەوە بوو. لیژنەکە تێك چوو. ئیش سەری نەگرت.

هەموو کەرەسەکان لای کاك مارف مانەوە، تەنانەت هەر زرووفی خۆشاردنەوەی کاك محەمەد وای کرد هەندێ نووسینیشی بەناوی کاك مارفەوە بڵاو بکرێتەوە، بەتایبەتی لە پێشەکیی هەندێ دیواندا. پاش ئەوە چەند جارێك باسی ئەو کەرەسانەم لەگەڵ کاك مارف کرد، وای پیشان دەدا کە نەمابن، بەڵام ئەوەی ئاگەی لە ئارشیفگەریی کاك مارف بێ، دەزانێ دەرزیی لێ ون نابێ[1]. مایەی بەختەوەرییە ئەمڕۆ کە دەرفەتی نووسینی کتێبەکەی کاك مستەفا پەیدا بووە، چەرخی چەپگەڕ مامۆستا هەمزەی هێشتا لە کیس نەداوین و فریای نووسینی چەند بیرورِا و پەراوێزێك کەوت، بەڵام لام وایە جێی باسە ئەسڵییەکەی ناگرێتەوە. مامۆستا هەمزە شارەزایەکی هۆشیاری باسی هەقەیە و لەبەر ئەوە بە بوونی ئەو ماوەی لێکۆڵینەوە بۆ ئێمەمانان کەمە و (هل يفتى ومالك في المدينة؟) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێز دەدەمە بەرخۆم کە بڵێم:

زۆر لە مەزهەبە باتینییەکانی ناو کۆمەڵگای موسوڵمان، پاشماوەی ئاینی تری پێش ئیسلامن و بۆ شاردنەوە هەندێ ڕێوشوونی ئیسلامیان تێکەڵ کراوە کە بەرەبەرە جێی خۆیان کردووەتەوە و بوونەتە بەشێك لە

---

(١) من خۆم یەکێ بووم لەوانەی لە بەدرەوە بەدەم بانگەوازەکەی لیژنەکەوە چووم کە لە ڕۆژنامەی (ژین)دا بڵاوکرایەوە و لە ١٩٥٦دا وتارێکی دووروودرێژم لە بارەی ژیانی مەلا و فەقێکانی کوردستانەوە بە ئەدرەسی کاك مارف خەزنەدار بۆ ناردن. پاش شۆڕشی پیرۆزی ١٤ی تەمووز کە لەسەر داوای خوا لێخۆشبوو شێخ قادری بەرزنجەییی خاوەنی گۆڤاری (شەفەق) دەستم بەسەر ئیدارەی گۆڤارەکەدا گرت کە پێشان بە دەست کاك مارفەوە بوو، کەوتمە خۆ ئامادەکردن کە بەبۆنەی شۆڕشەوە یەکەم ژمارەی چەرخی نوێی لێ دەرکەم. لەناو ئەو بابەتانەدا کە لە ئیدارەی گۆڤار بوون، وتارەکەی خۆمم لەمەڕ مەلا و فەقێیانی کوردستان دۆزییەوە و بردمەوە و پاش چەند ساڵ یەکەم جار لە ژمارەی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦٨ی گۆڤاری (التراث الشعبي)دا کورتەیەکیم بە عەرەبی و پاشانیش لە ژمارەی (٨)ی ساڵی ١٩٧٣ی گۆڤاری (بەیان)دا کورتەیەکی تریم بە کوردی بڵاوکردەوە-م.م.ك.

مەزهەبەکان. ڕەنگە یەزیدی و کاکەیی و ئیسماعیلییە و عەلیولاهی و تەنانەت ئەهلی حەقیش بچنە ئەم ڕیزەوە. بەڵام (هەقە)ی لای ئێمە بە پێچەوانەی ئەمەوەیە. هەقە خۆی تەریقەتێکی ئیسلامییە، واتە تەریقەتەکە سەر بە ئیسلامە (ئەگەر ئەوە بسەلمێنین کە تەسەوف و تەریقەت هەمووی سەر بە ئیسلام بێ)، بەڵام پێشتر ڕەگەزی ئاینی و ئایدیۆلۆجیی تری تێکەڵ بووە.

هەقە لە سەرەتادا هەر لەم تەریقەتی نەقشبەندییەوە هاتووە کە مەولانا خالید لە کوردستاندا بڵاوی کردووەتەوە[٢] بەڵام دوایی ڕەگەزی تر و تەوژمی بزووتنەوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی ناو کوردەواری ڕوخساری گۆڕیوە.

زۆر جار دەمانەوێ لەبەر ڕووناکیی تیۆریی زانستی ڕەگەزی یەکێك لەو ڕێبازانە شی بکەینەوە و بیبەینەوە سەر سەرچاوەی ڕاستەقینەی خۆی. نەبوونی زانیاریی ڕاست وخۆ دوورگرتنی خاوەن و سەرچاوەکانی ڕێبازەکە لە وتنی ڕاستی لە ترسی قامچی، ئێمەش لەگەڵ ئەوان لە دەرخستنی ڕاستی دوور دەخاتەوە.

زۆر لەم ڕێبازانە لە ترسا خۆیان و پێڕەوەکەیانیان لەبەرچاوی خەڵکی شاردووەتەوە، تا وردە وردە (شاردنەوە) بووەتە بەشێك لە ڕێبازەکان. بەش بەحاڵی هەقەش، تا ئێستا و تەنانەت لەم کتێبەشدا (بەلای منەوە) هەموو ڕاستی دەرنەخراوە. بەڵام ئەگەر وردبینەوە، دەبێ ئیسلام تا دمگاتە نەقشبەندێتیی کوردستان بکەین بە بناغە و ئەوەشمان لەبیر نەچێ کەوا لە ڕێبازی هەقەدا زیاتر سیمای ئابووری و ڕووکردنە گۆڕینی ژیان و گوزەران دیارە. هەر ئەمەش وامان لێ دەکات کە بەبزووتنەوەیەکی جوتیارانی بزانین، کە ساکارانە زۆر بیر و ڕێبازی ئاینی و ئابووریی کۆن و تازە کاری تێدا هەبێ. ڕەنگە ئەمە لای دەستەی حەمەسوور دیارتر بێ، بەڵام بەرەی مامە ڕەزایش لێیەوە دوور نین. ئەگەر ڕۆژگار ڕێگە بدا گەلێك

---

(٢) بڕوانە: پەراوێزی ژمارە (١) لاپەڕە (٣٣).

یادگاری تریش هەیە کە دەگێردرێنەوە و دەبنە بەڵگەی ئەم قسانە.

حەمە سوور هێشتا ماوە[٣]، بەڵام بەداخەوە تا ئێستا کەسمان بۆمان هەڵنەکەوتووە (هەڵەی خۆمان بێ یا دەرفەت نەبووبێ) بچینە لای و زۆر شت بنووسینەوە. ئەو هاوکاری و شێوەی هەرەوەزی ژیانەی حەمە سوورییەکان لە باریدا هەیە بەرە و بناغەیەکی جوان و پتەو و هاوچەرخی هاوکاری و هەرەوەز بڕوات.

ساڵی ١٩٦٤ هاورێیەکی خەڵکی گواتیمالام هەبوو، باسێکی سەیر و سەمەرەی بۆ گێڕامەوە و دوایش وتارێکی لەسەر باسەکە پیشان دام. باسەکە باسی چەند خێڵێکی سەر چیاکانی گواتیمالا بوو تازە خوێندەواران پێیان زانیبوون. ئەو خێڵانە هێشتا لە ژیانی کۆنی ڕەمەکیدا دەژین کە کۆمەڵی چینایەتی و کێشەی چینایەتیی بەخۆیەوە نەدیوە. باسەکە تەواو پشتی ئەو ئەنجامانەی دەگرت کە (مۆرگان) لە ناو خێڵەکانی ئەفریقادا گەیشتبوویێ. ئەو هاورێیەم دەیوت: پێشکەوتخوازەکانی گواتیمالا خەریکی ئەوەن ڕێ نموونیی ئەو خێڵانە وابکەن ژیانیان بەجۆرێ بگۆڕن کە چینی جیاواز و کێشەی چینایەتی هەر نەبینن.

تۆ بڵێی لە ژیانی کۆمەڵایەتیی وەك هیی هەقەکانەوە دەرفەتی تاقیکردنەوەیەکی وا لە وڵاتی ئێمەشدا هەڵبکەوێ؟

دوا پرسیار ئەوەیە بۆ هەموو هەقە بە کۆمەڵ لەگەڵ بزووتنەوەی چەپدا بوون: مامە ڕەزا ئاشتیخواز بوو، لە ساڵانی پەنجادا بانگەوازی بۆ خەڵك دەردەکرد کە بچنە ڕیزی ئاشتیخوازانەوە. هەروەها حەمە سوور و دێهاتی سەر بە حەمەسوور هەمیشە لە ڕیزی پێشکەوتخوازاندا بوون؟

ئەمانەش سەرمایەی یاداشتی چەند کەسی ترن لە کاتی خۆیدا بینووسن.

**تەواو**

---

(٣) ئەمە لەکاتی نووسینی ئەم پاشبەندەدا. ئێستا کۆچی دوای کردووە.

# پێڕست